ناوی کتێب: نیتشەو فێمینیزمی هاوچەرخ
نووسینی: نوشین شاهندە
وەرگێڕانی : محەمەد کەریم
بابەت: فیکری
بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق
مۆنتاژی کۆمپیوتەری: سەیران عەبدولرەحمان
سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد رەفیق
ژمارەی سپاردن : ١١٠ ی ٢٠٠٦
چاپی : یەکەم ساڵی ٢٠٠٦
کوردستان -سلێمانی
www.sardam.info

نوشين شاهندة

# نيتشةء فيَمينيزمى هاوضةرخ

**وەرگێڕانی لە فارسییەوە**
محةمةد كةريم

**سلێمانی- ٢٠٠٦**

# نيتشەو فێمينيزمی هاوچەرخ*

هـەرجۆرە نيشانەيەكی فێمينيـزم لای ئينسانەكان تەنانەت لای پياوێكيش، رێگای چوونە نـاوەوە بـۆ نـاو بەرهەمـەكانی مـن دەبەسـتێ: ئەوسـا ئيـدی نـاتوانرێ پـێ بخرێتـە نـاو نـاخی ئـەم هـەزار لۆغانەيـەوە كەسيخناخە لە ئاشكراكردنی دلێرانە.

(اينك ان انسان ١١١، ٣ )

نيتشـە وا بەناوبانگـە كـەزۆر دژی ژنـە، كەواتـە بۆچـی فێمينيسـتەكان مـەيليان بـەلای فەلسـەفەی نيتشەدا هەيـە؟ ئايـا دەتـوانرێ فەلسـەفەی نيتشـە لـە وتـە پـڕ لەسـوكايەتييەكانی دەربـارەی ژنـانو دژايەتييـەكانی بـۆ جوڵانـەوەی فێمينيسـتی ئـەوروپای مـۆدێرن جيابكرێتـەوەو ئـەو فەلسـەفەيە

---

* ئەم بابەتە بەشی سێيەمە لەكتێبی (زن در تفكر نيچە) نووسـينی (نوشـين شاهندە) بەوئومێـدەی لـە داهـاتوودا بتـوانم سەراپای كتێبەكە وەربگێڕم. (وەرگێڕ)

بەسەرچاوەیەك بۆ فێمینیزمی هاوچەرخ لەقەڵەم بدرێ؟ ئایا فەلسەفەی نیتشە دەتوانێت بۆ تیۆری فێمینیستی سوودمەندبێت؟ ئایا فێمینیستەکان دەتوانن سوود لەڕەخنەکانی نیتشە دەربارەی مێژووو بیری فەلسەفی بۆ ڕێگرتن لەهاتنەناوەوەی ژنان بۆ ناو ئەو مێژووە، وەربگرن؟ بۆچی فێمینیستەکان مەیلیان بەلای فەلسەفەکەی نیتشەدا هەیە، ئەوان چی لەخوێندنەوەی بەرهەمەکانی نیتشەو بیروباوەڕەکانی بەدەستدەهێنن؟ ئەمانە ئەو پرسیارانەن کە هەوڵدەدەین لەم بەشەدا وەڵامیان بدەینەوە.

بەشێوەیەکی گشتیی دەتوانرێ بگوترێ کە فێمینیستەکان، پەیوەندییەکی جۆراوجۆرو گۆڕاویان لەگەڵ فەلسەفەی نیتشەدا هەیە، هەندێکیان، دەربارەی سوودمەندیی فەلسەفەی نیتشە بۆ فێمینیزمی هاوچەرخ قسەدەکەنو هەندێکی تریان قسە لەزیانبەخشیی ئەو فەلسەفەیە دەکەن، لە ڕاستیدا دەتوانین بڵێین لێرەشدا، هەروەکو باقیی بوارەکانی دی، هەمان ئەو تەمومژو ناکۆکییە بەدیدەکەین کە لەسەراپای وتەکانی نیتشەدا بوونیان هەیەو لەڕاستیدا هەمان ئەم تەمومژەیە کە وێڕای

دژوارکردنـــــی تێگەیشــــتنی راســــتو دروســــت لەبیروباوەڕەکانی نیتشە، بۆتەهۆی سەرهەڵدانی راڤـەو گوزارشــــتی جیــــاواز ســــەبارەت بەبۆچـــــوونو بیروباوەڕەکانیو لەئەنجامیشـدا بۆتـە هـۆی ئـەکتیڤیو تازەیی ئەو بیروباوەڕانە. رەنگـە گـرنگترین کاریگـەریی نیتشـە لەسـەر بـیری سـەدەی بیسـت و دوای ئـەوەش ئـەوەبێ کـە نیتشـە بـوو بـە ئیلـهام بەخشـی مامەڵـەو بـیری نـوێ، ئـەم قسـانە دەربـارەی کاریگـەریی نیتشـە لەســەر فێمینیزمــی هاوچــەرخیش ڕاســتن. خــودی فێمینیســــتەکانیش دەربــــارەی پەیوەنــــدیی نێــــوان (نیتشەو ژن)، لـەدەوری ئـەو مەسـەلەیە کۆبوونەتـەوە کە دەبێ چۆن وتەکانی نیتشە دەربارەی ژنـانو ژنێتـی راڤــە بکــرێن؟ ئــەوەی فێمینیســتەکان لــەم بارەیــەوە بەدییان کردووە، ئـەوە روخساری پـڕ لـە سـووکایەتیو گاڵتەجاڕیی وتەکانی نیتشە نییـە، بـەڵکو ئـەوە هـەوڵی (ئـەو)ە بـۆ بەدەسـتەوەدانی شـێوازێکی نـوێ لـەگوتارو نووسینو فیکر، کە دەتوانێ بۆ فەلسەفەی فێمینیستی زۆر ســوودمەندبێ، لەڕاســتیدا دەتــوانین بڵــێین کــە ((بەســوودترین لایــەنی نووســینەکانی نیتشــە بــۆ فۆرمەڵـەبوونی فەلسـەفەی فێمینیسـتی، لەهەڵوێسـتی

ڕاشـكاوانەی ئـەودا نییـە دەربـارەی ژن، بـەڵكو دەبـێ لەشـــێوازو هـــەوڵی نیتشـــەدا بـــۆ خســـتنەڕووی فەلســەفەیەك دەربـــارەی لــەش‌و ئاشــكراكاریی ئــەو دەربـــارەی خوازەكـــانی گۆتـــەی فەلســەفیی‌و شــێوەی تایبــەتی نیتشــە بــۆ هەڵوەشــاندنەوەی پێشــداوەریی (نێرانە) لەبیروعەقڵی خۆرئـاوادا، بدۆزینـەوە)) (كیـت انسل- پیرسون، ١٣٧٥: ص ٢٤٣-٢٤٤).

لەم بەشـەدا، ئێمـە دەربـارەی هەنـدێ لەبنـەماكانی فەلسـەفەی نیتشـە قسـەدەكەین كـە فێمینیسـتەكانی بـــەلای خۆیـــدا ڕاكێشـــاوەو چـــەند ڕێگەیـــەكی بـــۆ پێشخســـتنی بزوتنـــەوەی فێمینیســـتی خســـتۆتە بەردەمیان ، بەڵام بەرلەوە بۆ ئاشـنایی و تێگەیشـتنی باشـــتر، دەبێـــت چـــاوێك بەجوڵانـــەوەی فێمینیـــزم و زەمینــە فەلســەفییەكانی و ڕەخنــەی فیمینیســتانەدا بخشێنین لەپێكهاتـە ئایـدیۆلۆژیی و ڕووناكبیرییـەكانی كۆمەڵدا .

جووڵانــەوەی فێمینیــزم جووڵانەوەیەکــە تیایــدا لایەنگیریی لەمافی ژن دەکرێ لەوێوە کە ژنان هـەرگیز لەپێگەی راستەقینەی خۆیاندا نەبوون یـان بەدەگمـەن لـەو پێگەیــەدا بــوون، ئــەم جووڵانەوەیــە خوازیــاری ئەوەیە کە پێگەی راستەقینەو شایستەی ژنان بۆ ژنـان بگەڕێنرێتەوە، ژنان هەمیشە ناچاربوون لەکوێرە رێـوە بچــنە مەیــدانی کۆمەڵایــەتیو سیاســیو رۆشــنبیریو فکرییــەوە، لەبەرئــەوەی هەمیشــە ژن وا لەقەڵەمـدراوە کـە بـوونی پەیوەسـتە بـەپیاوەوە، ژن شـوناسو بـوونی ســەربەخۆی نــەبووەو جگــە لەئاوێنــەی خــەیاڵاتی خۆنواندنو هەلپەرستی پیاو هیچ نەبووە کە هەمیشـە وەکــو ئــامرازو هۆکــار بــۆ گەیشــتن بــەئامانجو ئارەزووەکانی خۆی بەکاریهێناوە. ئەوە راسـتییەکە کـە (ژنــان لەگــەڵ پیاوانــدا بەیەکســانی ئیمکانــاتی پێگەیشتنیان لەبەردەسـتدا نییـەو دەتـوانین بڵێین کـە لەســەراپای کۆمــەڵگا مرۆڤایەتییەکانــدا، هەڵبەتــە بەپلـەی جیـاواز، خـاوەنی مـافی کۆمەڵایـەتی یەکسان نــین لەگــەڵ پیاوانــدا، بەنیســبەت گەشــەکردنی

ئـــــــابووریی‌و كۆمەڵایەتییـــــــەوە لەكۆمەڵگـــــــە پێشكەوتووەكاندا ژنان مافی زیاتریان هەیـەو هاوشـانی بەدەســـتهێنانی مــافی سیاســیو ئــابووری، لەســەدەی بیسـتدا، جیـاوازیی خۆیـان لەگـەڵ پیاوانـدا لەپێگـەی كۆمەڵایەتیـدا كەمكردۆتـەوە، بـەڵام هێشـتا ئەمــە بەمانای یەكسانی تەواو نییە كـە جووڵانـەوەی ئـازادیی ژنان بەڕاستی خوازیارێتی) (بابك احمدی،١٣٧٨،ص١٧١).

پیـاوان چـەندین سـەدە ژنانیـان چەوسـاندۆتەوەو بــواری فێربـــوونو پـــەروەردەكردنو شـــارەزابوونیان نـــەداونو ژنانیـــان لەناوەنـــدەكانی دەســـەڵات، واتـــە لەمەیدانـــە كۆمەڵایـــەتیو سیاســـیو ئابوورییـــەكان دوورخســـتۆتەوە. بەشـــێوەیەكی گشــتی (ڕێبــازی زاڵ بەســـەر روخســـارە رۆشـــنبیرییەكاندا لـــەپێناوی ئاراســـتەكردنی نابەرابـــەریی ژنـــانو پیاوانـــــدا فۆرمەڵـەبووە) (هـەمان سەرچـاوە). لەگـەڵ ئەوەشـدا هەندێ لەپیاوان باوەڕیان وایە كە ژنـان وێـڕای ئـەوەی لەگەڵ پیاواندا خاوەنی بـەهای یەكسـانن، دەتـوانن لـەو مەیدانانـەدا پابەنـدی هـیچ پیاوێـك نـەبن، بـۆ نموونـە ژنــانی ئــەمڕۆ دەتــوانن بەپیشــەكانی خۆیــان، وەكــو دكتــۆرو مامۆســتاو ئەنــدازیارو كاتــبو هتــد، بــژینو

ژیــانی خۆیــان بــەرەو پێشــەوەبەرن، بــەڵام ئــەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە ئەو پێگەیەی ئـەم جـۆرە پیاوانـە دەمی لێدەکوتن‌و کۆمەڵ بۆیـان فەراهەمـدەکات، تـەنها لەسنووری کارکردن‌و لـەژێر چاودێری پیاواندایـەو بـۆ پیاوانــە، ئــەو رۆڵــەی کــە کۆمــەڵی پاتریــارك بــەژنی دەدات، وەکو پلەکانی پەیژەیەك وایە کـە دەبـێ پیـاوان بەسـەریدا هـەنگاوبنێن بـۆ ئـەوەی بگەنـە بـەرزترین پێگەی خۆیان. لـەم روانینـەدا، بـۆ پیـاوان، ژنـان تـەنها کۆمــەڵێ پەیکــەرو لاشــەن بــۆ تێرکردنــی ئــارەزوو خواسـتە سێکسیەکانیان نـەك کەسانێك کـە بەڕاستی خاوەنی مافی یەکسان‌و بەهاو رێزی یەکسانیان هەیە. بەمشـێوەیە (ژن بـەپێی ماهیـەتێکی زگمـاك بـەژنیی لــەدایك نابــێ، بــەڵکو کۆمەڵگــە بەرەبــەرە دەیکــات بــە(ژن)، واتــە دەیکــات بەبوونــەوەرێکی ژێردەســت) (هەمان سەرچاوە،ل١٧٢).

هەنـدێکی تـر لـەپیاوان باوەڕیـان وایـە لـەوێوە کـە ژنـان بەشـێوەیەکی مێـژوویی وایـان هەڵبـژاردووە کـە لــەدەرەوەی ماڵــەوە چــالاکییان نــەبێت، لــەم رووەوە خۆیـــان لـــەهێزی کـــارو مەیدانـــە جیاوازەکـــانی بەدەســـتهێنانی دەســـەڵات دوورگرتـــووە، لەبەرئـــەوە

لەکاتێکـدا کـە لـەدەرەوەی ماڵـەوە دەسـت بەچـالاکیی دەکەن، دەبێ لەقۆناغە نزمەکانەوە دەست پێبکەن بـۆ ئـەوەی دوایـی بتـوانن بگەنـە پلـە بـەرزەکانی پەیـژەی پێگەیشـتنو پێشـکەوتن، بـۆ نموونـە بگەنـە پلـەی بەڕێوەبـەر، سـەرۆك، ئەنـدامی چـالاکی کۆمەڵایـەتیو هتد، بەڵام ئەوەی بنەمای فێمینیـزم شـەفافی دەکاتو روونـی دەکاتـەوە، ئەوەیـە کـە پیـاوان نائاگـا یـان بەهۆشـیارییەوە ژنانیـان چەوسـاندۆتەوەو کـەمتر ڕێگـەیان داون دەربـارەی تیـۆرە کۆمەڵایـەتیو سیاسـیو ئابوورییـەکانی کۆمەڵگەکـەی خۆیـان قسـەبکەنو تەنانـەت جـاری وا بـووە ڕێگـەی ئەوەشـیان نـەداوە دەنگی ژن بەگوێی کەس بگات. بەڕێگەنەدانی ژنان کە دەربارەی بیروباوەڕو بۆچوونو بەرپرسیارێتییەکانیان قسەبکەنو بەبەها دانەنانو ڕێزنەگرتنی ژنان، پیـاوان ژنانیـان چەوسـاندۆتەوەو دەنگیـان لەگەرویانـدا تاسـاندونو ئـەوەی کـە بەمـەعنای ژنێتـیو بـەژن ناوبردنـە، بەبێبـەهاو بێبایـەخ خسـتوویانەتەڕوو. لەئەنجامدا، پیاوان ژنانیان بە(غەیری خود)یان (ئـەوی دی) زانیـوەو وایـان لێکـردوون کـە بـەهاو بایـەخیان نەبێت.

ئامـانجی جوڵانـەوەی فێمینیـزم ئەوەیـە کـە ئـەم بۆچوونە بگۆڕێ کە بەنزمو ژێردەستە لـەژن دەڕوانـێ. جوڵانـەوەی فێمینیـزم بـەدوای ئـەوەدا دەگـەڕێ کـە بوارێـك بڕەخسـێنێ بۆئـەوەی ژنـان پێناسـەی خۆیـان بکـەن، بـەها تایبەتییـەکانی خۆیـان فۆرمەڵـە بکـەنو لەمەیدانـــە سیاســـیو کۆمەڵایـــەتیو زانســـتیو رۆشـنبیرییەکاندا دەنگـی خۆیـان بـەگوێی کەسـانی دی بگەیـــەنن. ئـــەم جوڵانەوەیـــە ئومێـــدەوارە بـــەوەی کۆمەڵگەیـەك دروسـتبێ کـە تیایـدا ژنـیش وەکـو پیـاو، رێـــزو بەهاداریيـــە تایبەتییـــەکانی خـــۆی هـــەبێو لەبنچینەدا وەکو مرۆڤێك شایانی رێزو بەهابێت.

## مێژووی جووڵانەوەی فێمینیزم

لـــەڕووی مێژووییـــەوە دەتـــوانرێ جووڵانـــەوەی فێمینیستی بکرێ بەسێ قۆناغـەوە، کـە هەریەکـە لـەم قۆناغانە وەکو زاراوە بە(شەپۆل)ناودەبرێ:

١-فێمینیزمی شەپۆلی یەکەم یان نـەوەی یەکـەم کـە لەســـاڵی(١٨٤٥)ەوە دەســـتی پێکـــردو تاســـاڵی(١٩٤٥) بەردەوام بوو.

٢-فێمینیزمی شەپۆلی دووەم یان نەوەی دووەم کە لەساڵی(١٩٤٥)ەوە هەتا(١٩٩٠)بەردەوامبوو.

٣-فێمینیزمی شەپۆلی سێیەم یان نەوەی سێیەم کە لەساڵی(١٩٩٠)ەوە دەستی پێکردووەو هەتا ئێستاش بەردەوامە. رەنگە بتوانرێ رەگوریشەکانی فێمینیزمی شەپۆلی یەکەم بگەرێنرێتەوە بۆ شۆرشی پیشەسازیی کە بواری بەژناندا جەخت لەیەکسانیی کۆمەلایەتی بکەنەوەو داوای مافی یەکسان لەگەڵ پیاودا بکەن. لەم رووەوە فێمینیزمی شەپۆلی یەکەم زیاتر لایەنی (ماف)بەسەریدا زاڵبوو. فێمینیزمی شەپۆلی دووەم، شتێکی زیاتر لەنایەکسانییە کۆمەلایەتیەکان دەخاتە ژێر پرسیارەوەو خوازیاری گۆرانی بونیادە سیاسیو کۆمەلایەتیو فەلسەفییەکانی کۆمەلگەیەو داوای هێنانەکایەی زمانی میتۆدۆلۆجیاو بیری فەلسەفی تایبەتی ژنان دەکات، لەم رووەوە ئەم فێمینیزمە فێمینیزمێکی شیکارییە کە بەبەکارهێنانی دەروونشیکارییو زمانناسیو فەلسەفە، بەربەرەکانیی ئەو بنەمایانەی کۆمەڵ دەکات کە لەسەر بیرکردنەوەی پیاو بنیاتنراون. فێمینیزمی شەپۆلی سێیەمیش زیاتر بەئیلهام وەرگرتن لەتێروانینی (هێلین سیسو- Helene

Cixous) دەربارەی جیاوازیی سێکسیو ئازادی سێکسی، دەیەوێ (جیاوازییەك)رەتبکاتەوە کە لەڕێگەی رووبەڕووبوونەوەی سێکسی ژنوپیاوەوە سەری هەڵداوە فێمینیستەکانی شەپۆلی سێیەم بۆ ئەوەی ناپەیوەستی خۆیان بەپیاوو سێکسی پیاوەوە ئاشکرا بکەن، مەیلی هاوڕەگەزخوازانە نیشاندەدەن بۆئەوەی لەو رێگەیەوە ئەوە دەربڕن کە هەتا لەو بوارەشدا پێویستیان بەپیاو نییە (بەم گروپە دەوترێ - Lesbian Feminists) .

ئەگەرچی زۆرکەس باوەڕیان وایە کە فیمینیستە هاوچەرخەکانو چالاکیو تیۆرەکانی ئەوان خاڵی دەسپێکی خۆی لەجووڵانەوەی ئازادیخوازانەی ساڵانی شەستەوە بەدەستهێناوە، بەڵام دەبێ رەگوریشە راستەقینەکانی جووڵانەوەی فێمینیستی بەدەیەکانی کۆتایی سەدەی بیست بزانرێ، بەدرێژایی ئەوەی کە سەردەمی پێشکەوتن بەدیاری بۆ هێناوین. بەدرێژایی ئەو ماوەیە ژنان مافی دەنگدانیان بەدەستهێناو بوون بەچالاکی دیار لەمەسەلە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمەکەی خۆیاندا، وەکو چاودێریی تەندروستی، پەروەردەو فێرکردن، سیاسەتو ئەدەب، بەڵام

یەکسانی لەگەڵ پیاودا لەم بوارانەشدا لەدەرەوەی دەسەڵاتیاندا مایەوە.

لەساڵی١٩١٩دا (ڤێرجینیا وۆڵف - (VirginiaWoolf 1882-1941))، بناغەی رەخنەی فێمینیستی لەوتارێکدا دانا کە بەناوی (ژووری تاکەکەسێك- Room of Ones Own) بوو تیایدا باسی کێشەکانی ژنانی نووسەری دەکرد، ڤێرجینیا لەو نووسینەدا باسی ئەوەی کرد کە پیاوان وەکو بوونەوەری بچوك‌و نزم رەفتاریان لەگەڵ ژنان کردووەو دەیکەن، بەرای ئەو، ئەوە پیاوانن کە مانا بەهەموو شتێ دەبەخشن‌و هەموو شتێ پێناسە دەکەن. تەنانەت ئەوە پیاوە کە ژنێتی پێناسە دەکات‌و تەواوی دامەزراوە سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، ئەدەبی‌و فەلسەفییەکان دەخاتە ژێر کۆنترۆڵ‌و چاودێری خۆیەوە. سەرەتای جەنگی دووەمی جیهان لەساڵی١٩٣٩داو کێشەکانی بەر لەشەڕو دوای شەڕ، سەرنجی تاکەکانی لەسەر کۆمەڵێ بابەتی تر چڕکردەوە. پێشکەوتنی بیری لەو جۆرەی دواخست، بەڵام لەگەڵ بڵاوبوونەوەی کتێبی (رەگەزی دووەم- Second Sex)ی (سیمۆن دوبۆڤوار-

1986-1908) (Simone de Beauvoir)لەساڵی ١٩٤٩دا، بایـــەخی فێمینیســـتی جـــارێکی تـــر دەرکەوتـــەوە. دوبۆڤـوار لـەم بەرهەمـەی خۆیـدا-کـە دەبـێ بـەکارێکی بنـــەڕەتی دابنـــرێ لـــەفێمینیزمی ســـەدەی بیســـتدا رایگەیانـــد کـــە کۆمەڵگـــەکانی خۆرئـــاوا، کۆمەڵگـــەی پاتریـارکین، واتـە ئـەو کۆمەڵگەیانـەن کـە بەدەسـتی پیـاوان کۆنترۆڵـدەکرێن. دوبۆڤـواریش وەکـو ئـەوەی پێش خۆی، واتـە ۆۆڵف، بـاوەڕی وابـوو پیـاوان ئـەوەی کـە بـەمانای مـرۆڤ بوونـە پێناسـەی دەکـەنو لـەو رووەوە، ئەوەش کە بەمانای ژن بوونە پێناسـە دەکـەن. دو بۆڤـوار لـەم بارەیـەوە دەیـوت لـەوێوە کـە ژن پیـاو نییـە، دەبـێ بـە(ئـەوی دی-Other)، دەبێـت بەبابـەتێك کە پیاو(بکەر)، بوونی پێناسەو دیاری دەکات.

ســـیمون دوبۆڤـــوار بەبـــەکارهێنانی بوونگـــەرایی (ئەگزیستانسیالیزم)ی سارتەر، هەوڵیدا رۆڵی ژنو پیاو شیبکاتەوە. لەڕوانگەی سارتەرەوە، مـرۆڤ سروشـتێکی هەتاهەتایی نییـەو هەریـەکێ لەئێمـە ئـەو شـتەین کـە خۆمان هێناومانەتە ئاراوە، ئـەم مەسـەلەیە دەربـارەی ژنو پیاویش راستە، دوبۆڤوار بـاوەڕی وابـوو نـاتوانرێ سروشتێکی لەپێشدا دەستنیشانکراوو هەتاهـەتایی بـۆ

ژن یان پیاو لەبەرچاو بگیرێو ئەو سروشتە لەپێشدا دیاریبکرێ یان بەجێگیرو لەگۆڕان نەهاتوو دابنرێ. بەباوەڕی دوبۆڤوار، پیاوانو ژنان دەبێ خۆیان لەکۆتی پێشداوەریی دەمارگیرانە رزگاربکەن، کە سروشتی پیاو بەئەکتیڤو مەترسی قبوڵ کەرو زیادەخواز دەزانێو بۆ ژنیش بەسروشتێکی دۆگماو وابەستە قایلە، هەروەها ناونیشانی کتێبەکەی دوبۆڤوار ئەوە نیشاندەدات، کە دوبۆڤوار باوەڕی وایە کە هەمیشە ژن خۆی وەکو پاشکۆو ژێردەستەی پیاو دەبینێ، ژن تەنیا ئەکتەرێکە کە رۆڵی دووەمی هەیە لەدامەزراوە کۆمەڵایەتیو رۆشنبیرییەکانی کۆمەڵگەکەی خۆیدا، چونکە هەموو ئەم دامەزراوانە بەدەستی پیاوانو لەژێر چاودێریی پیاواندا بەڕێوەدەچن و ژنان تەنیا دەتوانن کار بۆ پیاوان بکەن. جاری واش هەیە ژنان هیچ رۆڵێکیان نییە لەمەسەلە کۆمەڵایەتییەکانو رێکخراوە رۆشنبیریو سیاسییەکانی کۆمەڵگەکەی خۆیاندا، وەك ئەوەی بابەتو تەوەری سەرەکیی رۆشنبیریی ئێمە تەنها پیاوان پێکی دەهێننو ژن لەم رێگەیەدا جگە لەوەسیلەیەك بۆ پیاوان شتێکی دیکە نییە. لەم رووەوە دوبۆڤوار باوەڕی وایە کە ژن دەبێ

ئابلۆقـەکانی کۆمەڵگـەی پاتریـارکی بشـکێنێو ئەگـەر دەیەوێ ببێ بەمرۆڤێ لەپایـەگای راسـتەقینەی خۆیـدا دەبێ دژی ئەو چین بەندییەی پیاوان خەبات بکات کە ژن وەکـو(ئـەوی دی)حسـاب دەکـەنو خـۆی پێناسـەی بکـاتو خـۆی بناسـێنێ. لەگـەڵ هـاتنی شەسـتەکانی سـەدەی بیسـتو چـالاکییە سیاسـیو کۆمەڵایەتییەکانیـدا، بۆچـوونو قسـەی فێمینیسـتەکان ئـاوازێکی تـازەی پەیـداکرد. لەگـەڵ جوڵانەوەیانـدا لەمەیـدانی سیاسـیداو چـوونە نـاو مەیـدانی ئـەدەبیی بەدرێژایی ساڵانی١٩٦٠-١٩٧٠، رەخنـەگرە فێمینیسـتەکان بەڵگەیـەکی زۆریـان سـەبارەت بەدەسـەڵاتی پیـاوان بەسەر ژنانـدا لەڕێگـەی باڵادەسـتی پیاوانـەوە باسـکرد. لەم رووەوە، دوای رەخنەگرتن لەپێکهاتە سیاسییەکانی کۆمەڵگـە، دەسـتیان دایـە رەخنەیـەکی بنـەڕەتی لەپێکهاتـەی زمانـداو دژی پێشـداوەریی سێکسـی لەزمانـدا وەسـتانەوە. لێـرەدا لەڕەخنـەی سیاسـیو شـیکاریی دەکۆڵینـەوە، بـەڵام بەرلـەوە دەبـێ زەمینـە فەلسەفییەکانی فێمینیزمی هاوچەرخ باس بکـەین کـە رایەڵی نێوان ئەم بزووتنەوەیەو بیروڕای نیتشەیە.

## زەمینە فەلسەفییەکان

زەمینـــە فەلســـەفییەکانی گەشـــەکردنی ئـــەو فێمینیزمەی کە کاریگـەریی نیتشـەی لەسـەرە، رەنگـە زیـاتر بتـوانرێ بـەو کارانـە لەقەڵـەم بـدرێ کـە فەیلەسـوفە فەرەنسـییەکان‌و لـەوانیش جـاک دریـدا- Jaques Derida و میشـیل فۆکـۆ Michel Foucault (1926- 1984)) لـە سـەر بەرهەمـەکانی نیتشـە ئەنجامیانـداوە، ئـەم دوو فەیلەسـوفە فەرەنسـاییە کـە دەتـوانین بڵـێین بـیری پۆسـت بونیادگـەریی لەسەردەسـتی ئـەمان فۆرمەڵـەبوو، هـەردووکیان لـەپێناوی بـیری نیتشـەدا، تـەواوی عەقڵانییـەتی مۆدێرنێتەی خۆرئاوایـان خسـتە ژێـر پرسـیارەوە، ئـەم دوو فەیلەسـوفە لەبنچـینەوە نکـۆڵی لـەرێبازی میتافیزیـک لـەفیکری خۆرئـاواداو ئـەو دوالیزمـەش دەکەن کە ئەم فیکرە بنیاتی دەنێ، بۆ نموونە دریـداش هـەروەکو نیتشـە، هـەرجۆرە باوەڕێـک بەدژایـەتیی بەهاکان ڕەتدەکاتەوە کە بـە(میتـافیزیکی ئامادەبوون) نـاوی دەبـات، بـەڕای دریـدا بنچـینەی میتـافیزیکی خۆرئـاوا لەسـەر ئـەو ئەگـەرە وەسـتاوە کـە ((مانـا،

هەمیشــــە، ئامادەیـــــەو مانــــەوەی بەنــــەزانراوی لەبێدەسەلاتیی ئێمەوە لە دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست، یان لەناڕاستیی ئەو ئامرازەوە سەرچاوەی گرتووە کە هەڵمانبـژاردووە. دریدا دەڵێت لەمێـژووی فەلسەفەی خۆرئاوادا، هەمیشە گریمان لەسەر ئەوەبووە کە مانا لەقسەو عەقڵدا (کە هەردووکیان بە واژەی یۆنانی Logos دەردەبـڕڕێن)، ئامادەیـە، دریـدا ئـەم بـاوەڕی ئامــادەبوونی راســتەوخۆیەی بــەمانای (میتــافیزیکی ئامــادەبوون) نــاوبردووە)) (بابــك احمــدی، ١٣٨٧: ص ٤٨٣).

بنچـینەی میتافیزیـك هەمیشـە لەسەرچـاوەی جیـــاواز یــــان لەڕووبەڕووبوونـــەوەی دوالیزمـــەوە دەســتپێدەکات: بــۆ نموونــە دنیــا لەبەرامبــەر ڕۆژی دواییـدا، شــەڕ لەبەرامبــەر خێــردا، درۆ لەبەرامبــەر ڕاستیدا، لەش لەبەرامبەر ڕۆحدا، سروشت لەبەرامبەر فەرهـەنگو دواجـار ژن لەبەرامبـەر پیـاودا. ڕەخنـەی دریدا، لەمیتافیزیك ڕاست هەمان ئەو ڕەخنەیەیە کە نیتشـە لـەمیتافیزیکی هەیـە، ئـەو ئـەم بەراوردانـەی قبوڵ نییە: ((ڕەخنەی سەرەتایی دریـدا لـەمیتافیزیکی خۆرئـاوا ئەوەیـە کـە بـیری فەلسـەفی زانسـتی خۆرئـاوا

هەمیشە زینـدانیی فاکتـەری دوو جەمسـەری بـووە کـە خۆی دروستیکردوونو پاشان وایزانیووە کە لەڕاستیدا هـەن، بـیری میتافیزیـك هـەرگیز نـەیتوانیووە خـۆی لەبەندیی ئـەم زیندانـە رزگـار بکات)) (بابـك احمـدی، ١٣٧٠، ص ٣٨٤)

هەڵوەشـــاندنەوە (تفکیـــك)ی دریـــداش راســـت بەهـەمان مانایـە، واتـە دریـدا بـەنیازی هێنانـە ژێـر پرســیاری مــەیلی کــۆنو میتــافیزیکی فەلســەفەی خۆرئاوایـەو بـەهاوکاریی رێبازێك کـە بەهەڵوەشانەوە نــاونراوە، رەخنــە لەبنــەمای رێبــازی میتــافیزیکی خۆرئاواو بنچینەی ئەو رێبـازە دەگرێت، بـەم شێوەیە نیتشـە بنــەمای کارەکـەی بـۆ دریـدا ئامــادەکردووە، هـەروەکو پێشـان بینیمـانو لەئایندەشـدا دەیبیــنین، بـــاوەڕ نـــەبوون بەدژایـــەتیی بـــەهاکان کـــە رووبەڕووبوونــەوەی پیـاو/ ژن‌یـش یەکێکـە لەوانــە، هـەروەها رەتکردنــەوەی هـەموو جـۆرە دوالیزمێـكو رەخنەگرتنی تـەواو لەنـەریتو میتـافیزیکی فەلسـەفی خۆرئاوا، هەموو ئەمانە لەبنـەما سـەلێنراوەکانی بـیری نیتشەن.

فۆکـۆش وەکـو دریـدای هاوچـەرخی، بانگەشـەی هەڵوەشاندنەوەی دەربڕینە باوەکان دەکات، چ لـەزمانی فەلسـەفەو زانسـتو چ لـەزمانی ڕۆژانـەدا، بـەباوەڕی فۆکـۆ ئـەم زمانـە بـەتاڵ نییـە، بـەڵکو هـەڵگری پێشـگریمانەو وێناکردنـە فەرهەنگییـەکانی ڕێبازێکـە. ((شـیکردنەوەی قسـەی ڕەخنەگرانـە- Critical Discourse Analgsis= CDA کـە بەشـێوەیەکی ڕەخنەگرانـە زمـان دەخوێنێتـەوە، شـێوازێکە کـە لەلایەن میشیل فۆکۆ وە دامـەزرێنراوە، لـەم شێوازەدا بـاوەڕ وایـە کـە فاکتـەری وەکـو پێکهاتـەی مێـژوویی، پەیوەندییەکانی دەسـەڵات لەکۆمەڵدا، بنـەماو پرۆسـە کۆمەلایـەتیو فەرهەنگییـەکانو جیهـان بینییـەکان، زمان واتـە قسـەو تێکست فۆرمەڵە دەکەنو لەڕێگەی بـەکارهێنانی بـەردەوامی زمانـەوە لەکۆمەڵـدا، ئـەم پێکهاتـەو پەیوەنـدیيو بنـەماو پرۆسـەو جیهـان بینیانـە، جـێگیردەبنو دەمێننـەوە، بەمپێیـە، لـەنێوان ئـەو فاکتەرانـەو زمانـدا، پەیوەندییـەکی دوو لایەنـەو کـارلێکردنی بەرامبـەر هەیـەو ئەمـەش ڕاسـت هـەمان ئـەو شـتەیە کـە فێمینیزمـی تـەحلیلی (شـیکاریی) سوودێکی زۆری لێوەرگرتووە، هەروەکو دەبینین، باسـە

نوێکانیان دەربارەی زمانو باوەڕ بەبوونی شێوازێکی ژنانە لەقسەو گوتارو نووسینو هەتا لەبیرکردنەوەدا، رەخنەی لەزۆر بواری کۆن (سونەتی) گرتووە لەم زەمینانەدا، لەڕاستیدا، هەمان بیر رێگەی بۆ لێکۆڵینەوەی رەخنەگرە فێمینیستەکان کردەوە لەبواری زمانو فیکرداو بەم شێوەیە لەوە تێگەیشتن کە بابەت یان رەگەزی تێکستی زانستیو فەلسەفی، بابەت یان رەگەزێکی بەتاڵ نییە، بەڵکو بابەتێکی پاتریاركو دەسەڵاتخوازە: هەموو ژنێك بەچاکی دەزانێت کە قسەی حاکم لەڕێگەی بەکارهێنانی پەیوەندییە زمانیەکانیەوە ئەو بچووك دەکاتەوەو تاڕادەی بکەرێکی پەیوەندییە رەگەزییەکان کەمیدەکاتەوە، لەگەڵ رەخنەی نوێی فیمینیستیدا لەو واقیعە، بەکارهێنانی بەسێکس بووی زمان ( Sexist Language) دەستپێدەکات، بەپێی ئەم رەخنەیە، هەموو خوێندنەوەیەکی تێکستو هەموو تێگەیشتنێك لەبەرهەمی هونەریی لەسەر بنەمای (جنس) رەگەز وەستاوە، گوتارو نووسین بێلایەن نینو بەردەوام هەڵوێستی (جنسی) خۆیان دەردەبڕن، کەواتە دەتوانرێ بنەمای مانایی تێکست تێکبشکێنرێ

**کە لەسەر جیاوازیی ڕەگەز وەستاوە، بەڵام هەمیشە دەیەوێ نکوڵیی لەم جیاوازییە بکات یان دەیەوێت بنەمای ڕاستەقینەی خۆی بشارێتەوە، ئەم مەسەلەیە، هۆی سەرەکیی لایەنگریی ژمارەیەك لەڕەخنەگرە دیارە فێمینیستەکانی وەکو (هیلین سی سو)ە لەتیۆری هەڵوەشانەوە)) (بابك احمدی، ١٣٧٨، صص ١٧٤- ١٧٥)**

**بەم شێوەیە بیری دریداو فۆکۆ کە بە ئیلهام وەرگرتن لەتێڕوانینەکانی نیتشە، دەربارەی بیری فەلسەفی خۆرئاواو ڕەخنەلێگرتنی شێوەی گونجاوو جێگیریی خۆیان پەیدا دەکەن، دەبن بەپردێکی پەیوەندیی گرنگ لەنێوان فێمینیزمی فەلسەفی هاوچەرخو بیری نیتشەدا.**

## ڕەخنەی فیمینیستانە

**پێشان وتمان پیاوان چەندان سەدە ژنانیان چەوساندۆتەوەو لەناوەندەکانی دەسەڵات دووریان خستونەتەوە، لەبەرئەوەی پیاوان بەبەراورد لەگەڵ خۆیاندا لەڕووی جەستەو عەقڵەوە ژنیان بەبوونەوەرێکی لەخوارو نزم دەزانی ئەم بێبایەخ**

نیشـاندانەی ژنـان زۆر پێشـتر لەسـەردەمی ئێمـەوە هـەبووەو ئـەم بیروبۆچـوونە هەڵـەو دەمارگیرانـە لەکۆمەڵگـە پاتریارکییەکانـدا، لەنەوەیەکـەوە بـۆ نەوەیـەکی تـر دەگوێزرایـەوەو بەوشـێوەیەبوو بـەهۆی لـەدایکبوونی ئـەو رایـەی کـە ژنـان نـەك تـەنها لەگـەڵ پیاوانـدا یەکسان نـین بـەڵکو لـەپیاوان کەمتریشـن، بـۆ نموونـە ئەرسـتۆ دەیـوت لـەو شـوێنەدا کـە سروشـت نـەتوانێت پیـاو بخوڵقێنێـت، ژن دەخوڵقێنێـتو وا یـدەبینی کـە ژنـان لـەڕووی چـۆنایەتییەوە کەموکورتییان هەیە (ارسطو، فن شعر). لـەم ڕووەوە ئەرستۆ ژنانی لەڕیزی کۆیلەکاندا دادەنا کە مـەحکومن بەدیلێتیو شایانی ئـەوە نـین کـە لـەکارە گشـتییەکاندا بەشداری بکەن ،یان تۆماس ئـەکویناس بـاوەڕی وابـوو کـە(ژن پیـاوێکی ناتـەواوە) ئـەکویناس پیـاوی بـە(رەسـەنو سـەرەکی)و بەوشـێوەیە بەبـەرزو وەك خـودا دەزانـیو ژنـی بـە(مـادە) دەزانـی کـە دواجـار بێجوڵـەو نـەرمو گونجـاوە. تـەنها ئـەفلاتون هەنـدێك جورئـەتی نوانـدووەو ڕێگـەی داوە ژن بچـێتە ناو(کۆمارەکەیەوە)، دیارە ئەوەش بـەو مەرجـەی ژنـان هـەموو خەسـڵەتو هەسـتو سـۆزێکی ژنانـەو دایکانـە

لــــەخۆیان دووربخەنــــەوە (افلاطون،جمهــــوری).
لەســـەردەمی نوێشـــدا پیـــاوانی وەکـــو فرۆیـــد، ژنو ڕەگەزەکـــەی بەبـــەراورد لەگـــەڵ پیـــاوو ڕەگەزەکەیـــدا دەست نیشاندەکەن، بەڕای فرۆید ژن ژنـە لەبەرئـەوەی ئەنـدامی نێرینـەی پیـاوی نییـە. وەك ئـەوەی دنیـای ئێمـە تـەنها پیـاوان پێکیـان هێنابێـت دەڵێـی لـەم دنیایەدا هیچ ژنێك وجودی نییە!
هەروەکو پێشان ئاماژەمان بۆ کـرد، فیمینستەکان هەسـتیان کـرد کـە پیـاو، ئـەوەی کـە بەمـەعنای مـرۆڤ بوونــە، پێناســەی دەکــات، نــەك ژن، چــونکە ژن پیــاو نییــەو دەبێــت بــە(ئــەوی دی)، پیــاو بکــەرە واتــە ئــەو کەسەیە کـە مانـاداریی هـەموو شـتێك پێناسـە دەکات، لەکاتێکـدا کــە ژن بابەتــە، واتــە کەســێکە کــە پیــاوو دەســـەڵاتی پیـــاو پێناســـەی بـــوونی دەکـــاتو مانـــای پێدەبەخشێ کاتێ ژنێ هەوڵدەدات خۆی پێناسە بکـات، بــەوتنی ئــەم رســتەیە (مــن ژنــێکم) دەســت پێــدەکات، لەکاتێکدا هیچ پیاوێ شتی وا ناکات، چونکە پیاو نـەك تـــەنها خـــۆی، هـــەموو بەشـــەریەتو مرۆڤـــان پێناســـەدەکات، بەژنیشـــەوە ڕەخنـــەی فیمینســـتانەو ڕەخنـــەگرە فیمینســـتەکان دەیانـــەوێ ناڕاســـتی

بیروڕایەکی لەم جۆرە نیشانبدەن. لەسەردەمی کۆندا، ژنان لەکاتێکدا کە لەناو پیاواندا پەرش‌وبڵاوبوون، هیچ مێژوویەکی جیایان نەبوو وەکو باقی توێژە ستەمدیدەکان‌و پەیوەندییەکی نابەرامبەریان لەگەڵ پیاواندا هەبوو دەیان گوزەراند، رەخنەگرە فیمینستەکان باوەڕیان وایە ژنان دەبێ بۆ ئازادی خۆیان لەسەرکوتکردن‌و چەوساندنەوەیەکی لەوجۆرە ململانێ لەگەڵ ئەو یاسایەدا بکەن کە بۆتەهۆی فۆرمەڵەبوونی بیروڕای لەوجۆرە دەربارەی نزمیی ژن‌و لەئەنجامیشدا چەوسانەوەی ژنی لێکەوتۆتەوە، ژنان دەبێ بەهێنانە ژێر پرسیاری بیروبۆچوونی پیاوسالارانە دەربارەی ژن‌و رەگەزی ژن کە بۆ ماوەیەکی زۆر زاڵبووە، فەزایەك بخوڵقێنن کە کەمتر چەوسێنەرانەو زاڵمانەبێ.

بەشێوەیەکی گشتی رەخنەی فیمینیستانە لەچەند بوارێکی جیاوازی وەکو بایۆلۆجی(ژیانناسی)، ئەزموونی تایبەتی، زمان‌و قسە، دەروون شیکاریی‌و کۆمەڵناسیدا خۆی ئاشکرادەکات، ئەو بەڵگە هێنانەوەیەی کە بەگشتی پیاوان لەبواری بایۆلۆجیدا بەکاری دەهێنن، هەوڵدەدات ژن لەئاستی

بوونەوەرێکــدا بهێڵێتــەوە کــە لــەڕووی ژیانییــەوە لەبەرامبــەر پیــاودا توانایــەکی کــەمتری هەیــە، وتنــی ئــەوەی کــە (ژن جگــە لەمناڵدان شــتێکی دیکــە نییــە)، ئــەو تێڕوانینــە کورتدەکاتــەوە، پیــاوان جەســتەی ژن بەقــەدەرو چارەنووســی دەزانــن، بــەڵام ئایــا ئەمــە بــەو مانایە نییــە کــە هــەموو کۆششــێکی پیــاوان بــۆ هێنانــە ژێر پرسیاری رۆڵــی ســێکس بــۆ ئــەوە دراوەتــە پــاڵ ژن کــە لــەڕووی سروشــتییەوە لەبەرامبــەر پیــاودا نزمــی بکاتەوە، ئاشکرایە دژایــەتیکردنی مەســەلەکە ئاساییە؟ لەلایەکی ترەوە، رەخنەگرە فێمینیستەکان نــەك تــەنها سیفەتەکانی ژن بەمایەی نزمی ژن نازانن، بــەڵکو ئــەو ســیفەتە سروشــتیو بایۆلۆجیانــەی ژن بەســەرچــاوەی بەرزیو گەورەیی ژن دەزانن.

دووەم رەخنەی فیمینیستانە دەربارەی ئــەو قاڵبو کلێشانەیە کــە هەنــدێ لــەپیاوان، بــۆ نموونــە پیــاوانی نووســەر بــۆ ژنو کارەکتــەری ژن دایاننــاوە، رەخنــەگرە فێمینیســــتەکان ئـــــەوەیان نیشـــــانداوە کـــــە زۆر لەئەفسانەکانی ســەدەی نــۆزدەو بیست دەربــارەی ژنو کارەکتــەرو ئەزموونــەکانی ژن ناڕاســتن، لــەوێوە کــە تەنها ژنان ئەزموونی ژنانەی تایبــەتی خۆیــان هــەبووە

وەکو سکپڕیی‌و بێنوێژیی‌و منداڵبوون، تەنها خۆیان دەتوانن دەربارەی ژیانی تایبەتی ژن قسە بکەن، جگە لەوەش ئەزموونی ژنان لەژیاندا ئەزموونەکانی هەست‌و سۆزیش لەخۆدەگرێ. ژنان شتەکان بەو جۆرە نابینن کە پیاوان دەیبینن، ژنان سەبارەت بەپیاو بیروهەست‌و ئایدیای جیاوازیان هەیە لەدنیای دەوروبەری خۆیان، لێرەدا فێمینیستەکان وەکو سەرچاوەی فەزیلەتی ژنانە پشت بەئەزموونە تایبەتییەکانی ژنان دەبەستن.

سێیەم رەخنەی فیمینستەکان پەیوەندیی بەبواری زمان‌و قسەوە هەیە، بەڕای فیمنیستەکان ژنان لەبنەڕەتدا لەژێر فشاری زمانی باڵادەست‌و زاڵی پیاواندابوون، پیاوان زمانی ژنان بەنزم‌و لاوازو لەرزۆك دەزانن کە لەسەر چەند بابەتێکی بچووك‌و ناچیزو شێوازی ناجدیی‌و تەنانەت گێلانە چڕدەبێتەوە، پیاوان باوەڕیان وایە کە ژنان لەوەڵامەکانی خۆیاندا جەخت لەسەر قسەی هەست بزوێن‌و تاکەکەسی دەکەنەوە، لەکاتێکدا کە زمانی پیاوان بەتۆکمەو جێگیر دەزانن کە قابیلی لەرزین نییە، لەم رووەوە باوەڕیان وایە کە ژنان دەبێ

قسـەکردنی خۆیـان لەگـەڵ نموونـەی قسـەی پیاوانـدا هاوڕێك بکەن بۆ ئەوەی بتـوانن یەکسانی کۆمەڵایـەتی بەدەستبێنن، بەڵام رەخنەگرە فێمینیستەکان باوەڕیـان وایـە کـە ئەمـەش یـەکێکی تـرە لەکێشـەکانی پیـاوی بەهێزو ژنی لاواز، ئایدۆلۆژیایەکە کـە چـەندان سـەدە مێشکی ژنانیان پێ شۆردووە.

چـــوارەم رەخنـــەی فێمینیســـتەکان لـــەبواری دەروونشـیکاریدایە کــە زۆرجـار بەسـوود وەرگـرتن لەدەروونشـیکاری لاکـان کـە نیشـانی دەدات ئاگـایی بـۆ خــۆی میحـوەری(خــود) نییــەو داوای بەربــەرەکانی پێشداوەریی سێکسی دەکات لەزمانـدا دوای تیۆرەکـانی لاکــان دەربــارەی پیاچــوونەوەی بیروبۆچــوونەکانی فرۆیــد، جولیـا کریسـتیڤا Julia kristevaو لوسـێ ئیریگـاریirigaray Luce بـەئاقاری فەراهـەمکردنی تیۆری فێمینیستی سوودیان لێوەرگرت.

رەخنـــەی پێنجـــەمی فیمنیســـتەکان رەهەنـــدێکی کۆمەڵایـــەتی هەیـــەو مەســـەلەکانی کۆمەڵناســـی دەگرێتــەوە، ڤێرجینیـا وۆڵـف، یەکـەم رەخنـەگری ژن بـــوو کـــە لەمبارەیـــەوە قسەوباســـی کـــرد، لـــەو فیمینیســـتانەی بەتایبـــەتی لـــەمبوارەدا ئـــەکتیڤن

دەتوانرێ ئاماژە بۆ فیمینیستە مارکسیستەکان بکرێ کە هەوڵیانداوە پەیوەندییەك لەنێوان گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکانو هەلومەرجی ئابووریی لەگەڵ هاوسەنگیی دەسەڵات لەنێو رەگەزەکاندا دروستبکەن، ئێمە لێرەدا بەشێوەیەکی گشتی لەسەر دوو رەخنەی فیمینیستانە دەوەستین کە تەواوی بازنەو بوارە رەخنەییەکانیش لەخۆیان دەگرن، واتە ئەو رەخنەیەی کە فێمینیزمی سیاسیو فێمینیزمی شیکاریی لەپێکهاتە جیاوازەکانی کۆمەڵگەیان گرتووە فیمینیستە ئینگلیزەکان زۆریان لەبواری فێمینیزمی سیاسیدا چالاکن، ئەمان زیاتر لایەنگری گۆڕانی سیاسیو کۆمەڵایەتینو زۆرجار لەگەڵ خوێندنەوەی بیروباوەڕی مارکسیستیدا زۆر ئایدۆلۆژیکتر لەباقی فێمینیستەکان رەفتاردەکەن، بەم پێیە داکۆکیی لەگۆڕانە کلتووریىو کۆمەڵایەتییەکان دەکەن، فیمینیستە ئینگلیزەکان هەوڵدەدەن پەیوەندیی لەنێوان جۆری سێکسیو چین دا شیبکەنەوەو ئەوە نیشانبدەن کە چۆن پێکهاتەی دەسەڵاتی زاڵ لەرێگەی کاریگەریی پیاوانەوە لەسەر کۆمەڵ کۆنترۆڵ دەکرێتو لەئەنجامدا ژنان دەچەوسێنێتەوە، بەپێچەوانەی

فیمنیسته ئینگلیزەکانـەوە، فیمینیسـته فەرەنسییەکان لەسەر زمـان دەوەسـتن و ئـەو مەسـەلەیە شـیدەکەنەوە کـە چـۆن مانـا لەرێگـەی رەمزەکـانی زمانناسـییەوە بەرهەمـدێت شـیکردنەوەیەکی لـەمجۆرە زۆرجـار ئـەم رەخنانــە بــەرەو بــواری دیکــەی خوێندنــەوەی وەکــو میتافیزیك و دەروونزانی و هونـەر دەبـات. دواجـار ئـەم تیۆرسینانە باوەڕیان بەشێوازێك لەنووسـینی تایبـەتی ژنــان هەیــەو ئیــدیعای ئــەوە دەکــەن کــە (نووســینی ژنانە)لەبنەڕەتدا جیاوازە لەنووسینی پیاوانە.

ئێستا زیـاتر هەریەکـە لـەم دوو تیـۆرە رەخنەییـە فیمینیسـتانەیە ڕووندەکەینــەوە، واتــە فێمینیزمــی سیاسی و فێمینیزمی شیکاریی.

## فێمینیزمی سیاسی

یــــەکێك لەمەیلــــە فیمینیســــتیەکان لەفۆرمــــە تازەکەیـدا، زۆرجـار جـەختێکی تـەواو سیاسـی پێـوە دیـارە بـەو مانایـەی کـە فێمینیسـتەکان بەتوڕەییـەوە هەسـتی خۆیـان دەربـارەی نادادپـەروەریی دەردەبـڕن و هــەوڵی زۆر دەدەن بــۆ بەرزکردنــەوەی هۆشــیاریی

(سیاسـی) ژنـان لەبەرامبـەر ئـەو سـتەمەی کـە پیـاوان لێیـان دەکـەن فێمینیزمـی سیاسـی لـەم پێنـاوەدا بـۆ روونکردنەوەی هۆی چەوساوەیی ژنان سوود لەزاراوەی (باوکسـالاریی-Patriarchal) و(حکومـەتی بـاوك- the gover of the father) وەردەگـرێ، باوکسـالاریی ژن بەپاشکۆو ژێردەستەی پیاوێـك دادەنـێ یـان وەکـو پیـاو نزمو بچوك رەفتار لەگـەڵ ژنـدا دەکات، لـەم بارەیـەوە کـە زۆر کـەس ئـەم جـۆرەی فێمینیـزم بەهاوشـێوەی فۆرمەکانی دیکەی رادیکاڵی سیاسـی دەزانـن کـە تیایـدا ژنان وەکو گروپێکـی سـتەمدیدە، لەگـەڵ رەشپێسـتانو چـینی کرێکـاردا بـەراورد دەکـرێ (واتـە پیـاوە نزموبچـووکەکان لەڕوانگـەی حکومـەتی باوکسـالارەوە)بـەڵام هـەروەکو سـیمۆن دووبۆڤـواریش ئاماژەی بۆ دەکات، ژنـان بەپێچەوانەی رەشپێسـتانەوە، نەکەمایەتییـەکنو نـەوەکو پرۆلیتاریـا (چـینی زەحمەتکێش)یش بەرهـەمی مێـژوون، ئـەم مەسـەلەیە سـتەمی سـەر ژنـان دەکـات بـەدوو ئەوەنـدە، چـونکە هەریەکـە لـەم دوو کەمایەتییـە بـەلای کەمـەوە بـۆ خۆیـان خـاوەنی سـەندیکاو رێکخـراون بـۆ پاراسـتنی یـەکرپیزیـیو داکـۆکیی لەمافـەکانی خۆیـان، لەکاتێکـدا

ژنان واتە ئەو زۆرینەیەی کە نیوەی دانیشتوانی زەوی پێکـدەهێننو لەسەرانسـەری زەویـدا بڵاوبوونەتـەوە هیچ کام لـەو ئیمتیازانـەیان نییـە، لـەم رووەوە وتـراوە زۆرتـــرین چـــین کـــە چەوســـانەوەیان لەســـەرە، رەشپێستانو چینی کرێکارو ژنانن.

لـەمجۆرەی تیـۆری فیمینسـتیدا بـاس لەهـەردوو زاراوەی sex و genderو جیاوازییە گرنگـەکانی نیوانیـان دەکرێ.

(sex) رەگەزێکـــە لەروانگـــەی بایۆلۆجیـــەوە دەستنیشـاندەکرێ، لەکاتێکـدا کـە(gender)چـەمکێکی دەرونـزانییـــە کـــە بەشوناســـی رەگـــەزێ دەوتـــرێ بەشـێوەیەکی کلتـوریی بەدەسـتهاتووەو شـایەتی ئـەم ئیدیعایەیە، ئەو جیاوازیانەیە کە لەبەخشینی چەند سـیفەتێکی جیـاواز بـەپیاوانو ژنـان لەکۆمەڵگـە جیاوازەکاندا بەدیـدەکرێ بـۆ نموونـە، لەکۆمەڵگایەکـدا بەخشینی ئەم وەسفانە شتێکە کە لـەڕووی کلتـوریو کۆمەڵایەتییـــەوە ئەنجامـــدەدرێ، بـــەم پێیـــە فێمینیستەکان کاتێ رووبەڕووی ئەو دیدگایـە دەبنـەوە کـە باسـی سـیفەتەکانی ژنـان دەکـا کـە لەڕێگـەی کلتورییـەوە بەدەسـتهاتوون، وەکـو سـیفەتی سروشـتی

ژنــان رەفتــاری لەگەڵــدا دەکــەن کــارکردن لەپشــت ڕەگەزەکانــەوە، لەپەیوەندییــەکی نابەرامبــەرداو لــەژێر دەســتەییدا، هــەمان ئــەو شــتەیە کــە بــە(سیاســەتی ڕەگـــــەزی-sexual politic) نــــاودەبرێ (رامـــــن سلدن،١٩٨٩:من١٣٨).

فیمینزمــی سیاســی وێــڕای هێنانــە ژێرپرســیاری نایەکســــانیی کۆمەڵایــــەتی، رەخنــــە لەپێکهاتــــە کلتورییەکانیش دەگرێ کــە بەبــەراورد لەگــەڵ پیاوانــدا ژنان دەبەنە حاڵەتی ژێر دەستەییەوە هەروەکو پێشان باســکرا، پیاوســالاریی یەکێکــە لەوانــەو یــەکێکی تــر پەیمانی کۆمەڵایەتییــە کــە بــەو هــەموو کاریگەرییــەوە کە لەسەر بەیاساییکردنی دەزگا سیاسیەکانی خۆرئــاوا هــەیبوو، بووەهــۆی هەرچــی زیــاتری لاوازیــی ژنــانو پێگــەیان. یــەکێك لەتیۆرســینانی سیاســەتی هاوچــەرخ کــە لــەم بارەیــەوە رەخنــەو لێکۆڵینــەوەی ئەنجامــداوە (کــارۆل پیتمــان-Carole pateman)ە پیتمــان وێــڕای ئــــەوەی رەخنــــەی فیمینیســــتانە لەپێشــــداوەری باوکســالارانەی تیــۆری لیــبراڵ دیموکراســی دەگــرێ، بــاوەڕی وایــە کــە بــۆ بەدەســتهێنانی فــۆرمێکی دیموکراسیترو ئــەکتیڤتر لــەناوەڕۆکی تیــۆری سیاســی،

دەبێ تیۆری سیاسی بەڕاستییەکی گشت بخولقێنێ کە نەتوانێ (بەشێوەیەکی رەسمی یان نارەسمی، بەشێوەیەکی ناڕەوا دەسەلاتی چەند کەسێکی دیاریکراو (بۆ کامڵبوونی ئەکتیڤی سیاسی) زەوتبکات، زەوتکردنی دەسەلاتێك کە لەڕاستیدا، بەلایەنی کەمەوە تاکو پێش سەرهەڵدانی جولانەوەی فێمینیستی ئاراستەی ژنان کراوە) (جان لیت،١٣٧٨:ص٢٣٤٩).

پیتمان حەزی لەدووبارە لێکۆڵینەوەی رای تیۆرسینانی کلاسیکی وەکو هۆبزو لۆكو رۆسۆ و میل- ە لەبواری سیاسەتداو لەهەموان زیاتر لێکۆڵینەوە لەسەر جیاوازییەکانی بواری تایبەتیو گشتی دەکات لەکۆمەڵدا. بەپێی ( پەیمانی کۆمەلایەتی) تاك(فرد) ئازادیی سروشتی خۆی بۆ بەهرەداربوون لەئیمتیازاتی کۆمەڵگا دەخاتە لاوەو ملکەچی یاسا دەبێت لەکاتێکدا ئەم تاکە لەپەیمانی کۆمەلایەتیدا یان بەهەمان رادە ئازاد دەبێ کە لەباری سروشتیدا ئازادبوو، هەروەکوو رۆسۆ باوەڕی وابوو، یان ئازادیی سروشتی خۆی لەدەستدەدات، بەلای کەمەوە لەپێناوی بەدەستهێنانی ئەو ئاساییشەدا کە کۆمەڵ پێیدەبەخشێ هەروەکو

هۆبز وا بیریدەکردەوە، بەڵام لەم بوارەدا پیتمان بایـەخ بەپێناسەی کێشەسازیی مەیدانی سیاسی دەدات، بـەڕای پیتمان (نەك تەنها بوونی پلەکانی دەسەڵات، متمانـەی گریمانــەی تــاکی ئــازادو یەکسـان) دەخاتـە گومانــەوە، بــەڵکو ئــەو راســتیەی کــە بەشــێوەیەکی ســەرەکیی مەیــدانی سیاســی یــان لەگــەڵ مەیــدانی گشــتی-یــان کۆمەڵگای مـەدەنی-پێناسـە کـردووە چـەند ئـەنجامێکی خراپی ئاشکرای بۆ مافـە سیاسـییەکانی ژنـان هـەبووە. لـەم رووەوەیـە کـە سـەرەڕای تـەواوی ئـەو قسانەی کـە دەربارەی کەسـانێ دەوترێت کـە بـاری سروشـتییان واز لێهێنــاوە بــۆ ئــەوەی بچــنە نــاو کۆمــەڵگاوە، دیســان بەشــێوەیەکی ناســاز، بــاری سروشــتی لەکۆمەڵــدا بەشێوەی مەیدانی تایبەتی یـان مـاڵ بەرچاودەکەوێت بەتایبــەتی لــەدوای رۆســۆ، مــاڵ وەکــو قەڵــەمڕەوی تایبەتی ژنان لێك دەدرایەوە، چونکە مەیدانی تایبـەتی یان ماڵ کەم تازۆر لەگەڵ باڵادەسـتی بەرهـەمی ژیـانو دایکایەتیــدا بەپەیوەنــدیی ســۆزداریو خزمایــەتی دەناســرێ، بــەکورتی ئــەم مەیدانــە مەیــدانی (دەرکــەوتنی) بــەدەنو پەیوەندییــە تایبەتییەکانــە بەپێچــەوانەوە مەیــدانی گشــتی، مەیــدانی عــەقڵو

ئــازادیی گشــتی، خودســالاریی‌و داهێنــان، فێربــوون‌و باس‌وخواســتی عەقلانییــە بەحســابکردن بــۆ ئــەوەی بەشــێوەیەکی ســەرەکیی ژنــان ملکەچــی ئــەو پرۆســە ژیانیانــەن کــە پەیوەنــدیی بەبەرهــەمهێنانی وەچــەوە هەیــەو بەحسابکردن بــۆ ئــەوەی بەشــێوەیەکی گشــتی ژنان پەیوەستن بەسروشتەوە، هاتنی ژنان بۆ مەیدانی گشـــــتی کێشـــــەی زۆری لێدەکەوێتـــــەوە (جـــــان لچت،١٣٧٨:صـص ٢٥٠ ،٢٥١ لـەم رووەوە، پیتمـان دەگاتـە ئەو ئەنجامەی کە تاکی ئازادو یەکسان‌و دەرهاویشتەی تیــۆری سیاســی لەڕاســتیدا پیاوێکــە، چــونکە تــاکی کۆمەڵگای مەدەنی (واتە مەیدانی گشتی)پیـاوەو ژنـان لەمەیــدانی تایبــەت‌و سروشــتدا دەژیــن، لــەدەرەوەی بابەتی تیۆری سیاسین (بەمشێوەیە، تیۆری سیاسی بـاو گیرۆدەی ناکۆکیی نێوان پیـاوانی ئـازادو گشتی‌و ژنـانی سروشــت (لەبەرئــەوەی دیــل‌و تایبەتــە)) (هــەمان سەرچاوە،ل٢٥١).

بــەم پێیــە، پــەیمانی کۆمەڵایــەتی (پەیوەنــدیی برایانەیـە)و رێکەوتنێکـە کـە تـەنها لـەنێوان پیاوانـدا ئەنجامــدراوەو مەیدانەکــەی بەتــەواوی لەمەیــدانی تایبــەتی ژنــان واتــە(دنیــای شــوکردن کــە شــوێنی

نیشتەجێبوونی ژنانە) جیاوازە تەنها ڕێگایـەك كـە بـۆ چوونەناو مەیدانی گشتی پیاوان لەبـەردەمی ژناندایـە، ئەوەیە كە لاسایی پیاوان بكەنەوە، شوناسی پیاوانـەیان هـەبێ‌و بـەزمانی عـەقڵی نێـر قسـە بكـەن، بـەڵام ئـەم كـارەهـەروەكو نیتشـە دەڵێـت‌جگـە لـە(سـڕینەوەی ژنێتـی‌و غـەریزەی ژنانـە) ئـەنجامێكی تـری دەبێـت؟ ژنان دەبێ تیۆرێكی سیاسی بهێننە ئاراوە كە هەریەكە لەشوناسـی پیاوانـەو ژنانـە بتـوانن شانبەشـانی جیاوازییەكانیان لەو تێورەدا ئامادەبن.

## فێمینیزمی شیكاریی

فێمینیزمـی شـیكاریی بەبـەكارهێنانی تێورەكـانی لاكـان لـەبواری دەروونشـیكارییدا ڕەخنـە لەوپێشداوەرییە سێكسیانە دەگرێ كە لە زمان‌و مـافو فەلسـەفەدا هـەن. ئـەم فێمینیزمـە بانگەشـەی ئـەوە دەكات كە نابێ ئامانجی ژنان ئەوەبێ كەلەپیاوان بچن، هـەروەكو چـۆن زۆر جـار بۆیەكسـانی كۆمەڵایـەتی جەخت لەوە دەكرێتەوە، كە ژنان دەبێ زمـان و مـافو فەلسـەفەی تایبـەتی خۆیـان هـەبێ، فێمینیزمـی

شـیکاریی کـە زیـاتر لەفەرەنسا بەدیـدەکرێ بـەقووڵی لەژێرکاریگـەری دەروونشـیکارییدا بـووە، بەتایبـەتی ئەوکارانـــەی کـــە جـــاك لاکـــان(Jacque Lacan) لـەتیۆرەکانی فرۆیـددا کـردی. پـێش لاکـان، تیۆرەکـانی فرۆیـــد بەتایبـــەتی لەئـــەمریکا دابـــەزیبوو بـــۆ بایۆلۆجیـــەکیخاوو ناتـــەواو، لەبەرئـــەوەی ئـــەو تیۆرانەیان بەشێوەیەکی پۆزەتیڤیستیو تـەنها لـەرووی بایۆلۆجییـەوە دەخوێنـدەوە نـەك وەك مەسـەلەیەکی رەمزیی، فرۆید باوەڕی وابوو کەمنداڵی کـچ بـەبینینی ئەنـدامی سێکسی پیـاو لەکاتێکدا کـەخۆی ئەنـدامێکی وای نییـە، خـۆی وەکـو رەگـەزێکی مـێ یـان ژن دەسـت نیشـان دەکـات، ئەومنداڵـە کچـە خـۆی بەشـێوەیەکی نێگەتیڤ پێناسە دەکات، واتـە دەڵێـت مـن ژنم چونکە خـاوەنی ئەنـدامی نێرینـەی پیـاونیم. کەواتـە بنـەمای دەستنیشـــانکردنی حاڵـــەتی رەگـــەزیی لەروانگـــەی فرۆیدەوە ئەندامی سێکسی پیاوە، بەپێی قسەی فرۆید ژن لـە(ئێرەیـی بـردن بەئەنـدامی سێکسـی پیـاو- Penis envy) کەمەسەلەیەکە قابیلی خـۆ لـێلادان نییـە، ئـازار دەچێژێ و ئەم ئێرەییبردنە بەڕای فرۆیـد لای تـەواوی ژنـــان هەیـــەو خـــاڵی هاوبەشـــەو ئـــەم مەســـەلەیە

فاکتـەری(گرێـی خەسـیوی-Castration complex) ە لای ژنان ،هەرچەندە هەندێ لەفیمینیستە فەرەنسییەکان جەختیان لەوەکردۆتـەوە کـە (ئەنـدامی سێکسی پیـاو-Panis Phallus) کــە فرۆیــد باســی دەکــات، تــەنها رەمزێکەو بەراستی چەمکێکی بـایۆلۆجی نییـە، بـەڵام جاك لاکان بە بـەکارهێنانی ئـەم زاراوەیـە، ئاماژەیـەکی ژێر بەژێر بۆ پەیوەندی ئەم ئەندامانـە دەکات لەگـەڵ ســرووتە ئاینیـــەکانی بـــەپیتیو بەرهـــەم زۆریـــدا لەســـەردەمی کۆنـــداو بـــەکارهێنانی ئـــەم زاراوەیـــە لەئــەدەبیاتی خوداناســیو مرۆڤناســیدا وەکــو فــۆرمو رەمـــزی دەســـەڵات دەخاتـــە روو(رامـــن ســـلدن، ١٩٨٩ ص ١٤٦).

ویـــڕای ئـــەوەی وتـــرا، (گرێـــی ئۆدیـــپ- odipus complex) کـە فرۆیـد دارێـژەرێتی، دیاردەیەکـە تیایـدا کوڕ-واتـە ئـۆدیپی ئەفسانەی یۆنـانی- دەیـەوێ بـاوکی لەسـەر رێـی خـۆی لابـەرێ بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ دایکیـدا بخەوێ، هەروەکو ئەو کوڕانەی کەلە(مێگەلی سـەرەتایی داروین) دا کەفرۆیـد ئـەوە لـەکتێبی(تەوتـەمو حـەرام-Totem and Taboo) دا بـــاس دەکـــات دەیانـــەوێ بەکوشــتنی باوکیــان ژنــەکانی بەدەســت بێــنن بــەڵام

هـەردوو کوڕەکـە بەکوشـتنی باوکیـانو لـەناوبردنی تووشـی هەسـتی گونـاهو پەشـیمانی دەبـنو چاوپۆشـی لەبەدەسـت هێنـانی ژنـەکانی باوکیـان دەکـەن. فرۆیـد بەباسـکردنی ئـەم دووچـیرۆکە دەیـەوێ ئـەوە نیشـان بـدات کـە(نەسـت)(مـن) هەمیشـە هەوڵـدەدات خـۆی لەسـەرکوتکردن بدزێتـەوەو بەوشـێوەیە سیسـتمی ڕەمزی (منی باڵا) دوربخاتـەوە، نەست نیشانەی خـۆی بەشـێوەی لەمپـەرێك (وەکـو زەڵلـەی زمـان) لـەڕەمزدا دەهێڵێتـەوە (جـان لچـت،١٣٧٨:ص٣٦) جگـە لەمـەش، ڕۆڵـی سـەرکوتکردن لەروانگـەی فرۆیـدەوە، بەتایبـەتی بـۆ شـیکردنەوەی خـەون، ڕۆڵێکـی پێویسـتە لـە شـیکردنەوەی خەونـدا، فرۆیـد دەڵێـت خـەون بیـنین لەراسـتیدا بـەدیهاتنی چـەند ئارەزوویەکـە، کەسـی خـەون بـین نـەیتوانیوە لەواقیعـدا بـەدییان بهێنـێ، بـەباوەڕی فرۆیـد خـەون لەبنەڕەتـدا پەیوەسـتە بـەئارەزووی سێکسـییەوەو ئـارەزووی سێکسـیش خـۆی لەشـێوەیەکی تـردا ئاشـکرا دەکـات واتـە لەهـەمان خەوندا، بەمپێیە بەخەون بینین ئارەزوەکانمـان بـەدی دێـت ..لەلایـەکی تـرەوە، خەونـەکانمان کـە نەسـتمانە، وێـڕای بـەدیهێنانی حـەزو ئارەزووەکانمـان ئـەو

یادەوەرییانـــەش ســـەرکوتدەکات کەمایـــەی ئـــازارن‌و زیانیـــان لێدەکەوێتـــەوە کـــە ئـــەوانیش ماهیـــەتێکی سێکسییان هەیە لێرەدا رۆڵی سـەرکوت کـردن رۆڵێکـی پێویسـتە لەبەرئـەوەی سـەرکوتکردن بەرلەهەرشـتێ شـێوەیەکی بەرگرییـە بـەلاَم لەگـەڵ بلاَوبوونـەوەی بەرهەمـەکانی جـاك لاکـان‌و راڤـەی بونیادگەرایانـەی لاکـان بـــۆ تێۆرەکـــانی فرۆیـــد، راڤەیـــەکی نـــوێی ســـەرکوتکردنیش هاتـــە ئـــاراوە ( لـــەم بەرهەمانـــەدا، ســـەرکوتکردن بـــەخودی پێکهێنـــانی بکـــەر لـــەزمان‌و مەســـەلەی رەمزییـــەوە گرێـــدەدرێ ســـەرکوتکردن دەتوانـێ ئەوشـتەبێ کـە ئەگـەری جیاکردنـەوەی بکـەر لەبابەت دەکات بـەکاری کـردە)(هـەمان سەرچاوە ل٣٥) لەڕاســتیدا پێشــکەوتنی تیــۆری لاکــان دەربــارەی راڤـەکردنی بیروبۆچـوونەکانی فرۆیـد لەوەدایـە کەلـە بـێ چـەندو چـوونی بـایۆلۆجی ئـەو بیروبۆچـوونانە دوور دەکەوێتـەوەو دەروونشـیکاریی فرۆیـد لەرێگـەی زمانــەوە بەسیســتمی کۆمەلاَیەتییــەوە دەبەســتێتەوە (لاکـان بەتەئکیدکردنـەوەی بونیـاد گەرایانـە لەسـەر زمـان هـەروەکو سیسـتمێ لـەجیاوازی کەلەسـەلماندن

بێبەشـە، بايـەخى زمـانى لەبەرهەمـەكانى فرۆيـددا بەرجەستەكرد)(هەمان سەرچاوە،ل١١٢).

لاكان بەبەكارهێنانى تيۆرى فێرديناند دى سوسێر دەربـارەى پەيوەنـدى ئارەزوومەندانــەى نێـوان دال‌و مـــەدلول، نيشـــاندەرێكى خســـتە روو كەتيايـــدا ئيختيـــاريبوونى رۆڵــە سێكســـييەكانى ئاشـــكراكرد، فێمينيستەكان ئەم نيشاندەرەيان بەسوود بـەخش بـۆ تيۆرەكانى خۆيان دەست نيشان كردووە.*



پياو ژن درەخت

لەوێنـەى يەكەمـدا، پەيوەنـدى نێـوان وشـەو شـت، هاورێكـەو دەلالـەتێكى(سروشـتييە)كـە بـەپێى ئـەوە وشەوشـت، بەشـێوەيەكى سروشـتى، لەيـەك مانـاى هاوبەش‌و گشتييدا يـەكگرتوو ويەكسان دێنـە بەرچاو

---

* لــە Areader's guide to cantemporary literarg theorg وەرگێراوە، نووسينى رامەن سلدن.

بۆ نموونە،وشەی(درەخت) هەمیشە(دال)ە بۆ درەخت وەکوشتێكو ئەم دالە، هەمیشە دالی هەمان مەدلولە ئەمە بۆچوونێك بوو کەلەتیۆرەکانی پێش سوسێردا هەبوو، بەڵام هەروەکو وتمان لەگەڵ تیۆری سۆسێردا دەربارەی پەیوەندیی ئارەزوومەندانەی نێوان دالو مەدلوول، ئەم پەیوەندیو هەماهەنگییە کۆنە لەناوچوو، لەوێنەی دووەمو سێیەمدا لاکان نیشانیدا کەدالی(ژن) دەلالەت لە مەدلولێك دەکات کەلەو مەدلوولە دەچێ کەدالی(پیاو) دەلالەتی لێدەکات. لەڕاستیدا دالی(ژن)و(پیاو) دەلالەت لەودەرگایانە دەکات کەیەکسانن ولەیەکدەچن ، ئەم دەرگایانە(یەکسانن) بەڵام بۆ چوونە ژوورەوە بەدوو جۆر سیستمی جیاوازی زمانی دروستکراون، لەم ڕووەوە، ئێمە بەناچاریی بە(جیاواز) دەیانبینین بەم پێیە،ژن(دال)ێکە نەك رەگەزێکی مێ لەرووی بایۆلۆجییەوەو لەنێوان بەدەنێك بەخاسیەتی تایبەتییەوەولە دالی(ژن)دا هیچ پەیوەندییەك وجوودی نییە، کەواتە دالی(ژن) لەگەڵ دالی(پیاو)دا هیچ جیاوازییەکیان نییە دەتوانرێ بگوترێ کە(سەبارەت بەتیۆری سۆسێر دەربارەی پەیوەندی

ئارەزوومەندانـــەی نێـــوان دالو مـــەدلوول، لەگـــەڵ مامەڵەکردن لەگەڵ زماندا وەکو سیستمێ لـەجیاوازیی، لاکـان سـوور بـوو لەسـەر ئـەوەی بڵێـت تاسـەرەتای شەستەکانی سەدەی بیست، بکەر بکەری دالـە، لـەوێوە کەهەمیشـە دال لەمـەدلوول جیایـەو سـەربەخۆییەکی راستەقینەی هەیە، دواجار هیچ دالێ بۆ هەمیشە وەکو دالی مـــەدلوولێ نامێنێتـــەوە قەڵـەمڕەوی دال بریتیـە لەقەڵەمڕەوی سیستمی رەمزیی واتە سیستمی جۆرەها ئامــاژەو رەمـــزو دەلالـەتو رەنگدانـەوەو وێنــە لـەم سیستمەدایە کە تاك وەکو بکەر فۆرمەڵە دەبێت(جان لچت،١٣٧٨:ص١١٣).

پێشـــان وتمـــان کـــەلاکان بەبـــەکارهێنانی رۆڵـــی سـەرکوتکردن لـەبیرو بـۆ چـوونەکانی فرۆیـددا، بـەو ئەنجامەگەیشـــت کەســـەرکوتکردن دەبێتـــە هـــۆی جیابوونـەوەی بکـەر لەبابـەتو لەبنەڕەتـدا دروسـت بـــوونی بکـــەر، لەقەڵـــەمڕەوی سیســـتمی رەمزیـــدا روودەدات بۆ باشتر تێگەیشتن لـەم وتانـە، راڤـەکردنی لاکـان بـۆ گرێـی ئـۆدیپی فرۆیـد دەتوانـێ سـودبەخش بێـــت، لاکـــان ئـــەم راڤەکردنـــە لەســـێ قۆناغـــدا ڕووندەکاتەوەو بەهاوشانی داخڵبوونی منداڵی دەزانێت

بۆ قۆناغی زمان کە لەگەڵ جیابوونەوەی منداڵدایە لەدایك(جیابوونەوەی بکەر لەبابەت):

١-منداڵ(کوڕ) لەسەرەتادا لەگەڵ دایکیدا لەیەکێتی تەواودایەو بەتەواوی خۆی لەگەڵ دایکیدا دەناسێنێو دەستنیشان دەکات ئەم منداڵە(کوڕ) لەخۆیەوە دەیەوێ هەرچی لەدایکیدا نایبینێ یان بەکەم دەیبینێ، تەواوی بکات ئەوەی کەمنداڵ هەستی پێدەکات ئەوەیە کەدایکی ئەندامی نێرینەی نییەو ئەم نەبوونە، سەرەتای داخڵبوونی منداڵ بۆ قۆناغی زمانی فەراهەمدەکات کە لەگەڵ جیابوونەوەیدایە لەدایکی بەم پێیە(دوای جیابوونەوە، دایك دەبێت بەیەکەم بابەتی منداڵ، واتە دەبێت بەیەکەم ئەزموونی ئەو لەغیاب یان لە لەدەستداندا)(جان لچت،١٣٧٨:ص١١٥).

وادێتە بەرچاو کە هەوڵی لاکان بۆ دوبارە راڤەکردنی بیروبۆچوونەکانی فرۆید، بەئیلهام وەرگرتن لەراڤەکردنی ئەلیکساندەرگوژو، دەربارەی هیگل-بەتایبەتی دەربارەی دیالەکتیکی نێوان خوداو بەندە-دەستی پێکردبێ(ئەوەی خۆی لێرەدا نیشانی دەدات، رۆڵی ئەوی دییە وەکو فاکتەری بنەڕەتی مەیلی ئینسان، مەیل، لەوێوە کەلەسەر لەدەستدانی

بابــەت) (لــەقۆناغی یەکەمــدا، دایــك) بنیــاتنراوە، شوناسـی بکـەر تەئیـد ناکـات بـەڵکو دەیخاتـە ژێـر پرسیارەوە ،لەراستیدا مەیل بوونی درزێك لەبکەردا نیشان دەدات(هەمان سەرچاوەی پێشوول١١٢)

٢-منـداڵ(کـوڕ)دوای حـاڵیبوون لـەوەی کـەدایکی ئەنــدامی نێرینــەی پیــاوی نییە،دەیــەوێ لــەحاڵی حـازردا رۆڵـی نێرینـە ببینـێو جێنشـینێکی ئەنـدام نێرینە Phallus بێت کـە دایکـی نییـەتی، بـەڵام لـەم حاڵەتەدا رووبـەڕووی (یاسـای بـاوك) یـان(نـەخێری بــاوك) دەبێتــەوە، باوکێــك کــە رێگــرە لەبــەردەم منداڵی کوڕدا بۆ خۆناسین بەئەنـدامی نێرینەیـەوە هەروەها رێگرە لەبـەردەم ئەگـەری قبـوڵکردنی ئـەم شوناســە تازەیــەی منداڵەکــە لەلایــەن دایکــەوە( لەڕاســتیدا لاکــان، وەکـو شـتێك کەلـەناوی باوکـدا بەرجەســتە دەبــێ قســەی لەســەر یاســادەکرد: بــەم شێوەیە (سیستمی رەمزی) کراوە بەنموونە لە(نـاوی باوك)دا کۆمەڵ پێکدەهێنێ یان دەتـوانرێ بگـوترێ- بەپەیڕەوی کردنـی چیرۆکەکەی فرۆیـد لەتەوتـەمو تابۆدا-کوڕەکان بەرێزگرتن لەباوکێکی مردوو دەست لەمافی خاوەنداریێتی ژنـەکانی باوکیـان هەڵدەگرن)

(هـــــەمان سەرچـــــاوە،ل١١٥). بـــــەم پێیـــــە، رووبەڕووبوونـــەوەی(یاســای بــاوك) بۆمنــداڵی كــوڕ، خەساندنی لەگەڵدایە.

٣-ئێستا ئیـدی منـداڵی كوڕ بـەباوك دەست نیشان دەكرێــت، كــوڕ خــۆی وەكــو بــاوكیو وەكــو كەســێك كەخاوەنی ئەندامی نێرینەی پیاوە( بـەڵام نـەك وەكو كەسێك كەلـەحاڵی حـازردا بەراست دەتوانـێ هـەیبێ) دەبینێو چەمكێكی تـازە بەشوناسـی خـۆی دەبەخشێ واتە دەتوانـێ ببـێ بەكەسـێ كـەرۆژێك جێگـەی بـاوكی دەگرێتەوە بەم شێوەیە، منداڵی كوڕ ئـارەزوو و مـەیلی بێوێنـەی خـۆی بـۆ دایكـی سـەركوتدەكاتو لـەجیاتی ئــەوە یاســای بــاوك قبــوڵ دەكــات. لــەم رووەوەیــە كـە:(بـاوكیش بـەنۆرەی خـۆی فاكتەرێكـە كـە دەست لەپەیوەندی نێـوان دایـكو منـداڵ وەردەدات، بـەجۆرێ كەمنـداڵ بـە وێنـاكردنی خـۆی وەكـو بـاوك دەتوانێـت شوناســــــێك بـــــۆ خــــــۆی فۆرمەڵــــــەبكات) ٭جان لچت،١٣٧٨:ص١١٥.

لێــرەدا لاكــان پێگــەی بــاوك بەپێگــەی(مەســەلەی رەمزیی)و پێگەی دایك بەپێگەی(مەسـەلەی واقیعـی)و پێگەی منـداڵ بەپێگەی(مەسـەلەی خـەیاڵی)دەزانێت.

مەسـەلەی رەمزیـی هەمیشـە جێنشـینی شـتێکە کەلەجێگـەی خۆیـدا نییـە یـان نادیـارە، مەسـەلەی واقیعـی هەمیشـە لەجێگـەی خۆیدایـەو مەسـەلەی خـەیاڵی لەجێگایەکدایـە، کەتیایـدا بکـەر سروشـتی مەسەلەی رەمزیی بەهەڵە وەردەگرێ بەرلەمـە وتمـان کەیـەکێك لەبەشـەپێکهێنەرەکانی بکـەر، سیسـتمی رەمزییـە، بـەڵام جگـە لەمەسـەلەی رەمزیـی واتـە ئـەو رۆڵەی کە باوك لەدروستکردنی بکـەردا لەئەسـتۆیدایە، مەسـەلەی واقیعـیو مەسـەلەی خـەیاڵیش دەسـتیان لەدروسـتکردنیدا هەیـە، واتـە ئـەو رۆڵـەی کـە دایـكو منـداڵو پەیوەنـدیی ئـەم دوانـەو لەکۆتاییـدا جیابوونەوەی منداڵ لەدایك دەیبینێ ،بەم پێیە منداڵ بەداخڵبوونی بـۆ مەیـدانی(مەسـەلەی رەمزیـی) زمـان، کەلـە پەیوەنـدی نێـوان لێکچوونو جیـاوازیی هاتۆتـە ئـاراوە، بەمانایـەکی تـازەی شـوناس دەگـات. لەراسـتیدا، بەقبوڵکردنی یاسای باوك ئەوکوڕەی چۆتە نـاو فـەزای سێکسـەوە دەبێتـە خـاڵی پەیوەنـدیی مەسـەلەی زمـانی درککـردنو وێنـاکردنی رۆڵـی مـەجازیی بـاوك لـەم نێوانەدا زۆر گرنگو بنەڕەتییە باوك پێگەی یاسادانان دادەنێ، نەك لەبەرئـەوەی کـە کرداری بەرهـەم هێنـان

نموونەیـەکی بـاڵاتری هەیـە-وەکـو ئـەوەی لـەرابردوودا وێنـادەکرا-بـەڵکو تـەنها لەبەرئـەو کاریگەرییەیـە کـە لەسیســتمی زمانیــدا هەیــەتی، لەبەرئــەوەی بــاوك بەلەقاڵبــدانی ئــارەزوو و مــەیلی منــداڵو لەڕاســتیدا ســەرکوتکردنی، بــەقبوڵکردنی پێویســتی جیــاوازیی سێکســی(یــان ئــەم/یــان ئــەو) منــداڵ دەگــۆڕێ بــۆ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی.

هەنـدێ لەفێمینیستەکان رەخنـەیان گرتـووە کـە تەنانەت ئەگـەر ئێمـە روانینێکـی تـەواو(رەمزیـی)مـان سـەبارەت بەئەنـدامی نێرینـەی پیـاو هـەبێ-هـەروەکو لاکـان وادەکـات-دیسـان وادێتـە بەرچـاو کـە کاریگـەریی گۆتــەو ریزبەندییــەکانی جیــاوازی سێکســی لەلایــەن لاکانەوە، بەناچاریی رۆڵێکی نزمو کەمی دەبێت بـەلای سێکسـی ژنـەوە. ئەوەڕاسـتە کـەلاکان جـەخت لـەرۆڵی مەجازیی ئەندامی سێکسی پیاو دەکاتەوە-جەخت لـەو رۆڵـە دەکاتــەوە کـە بەڕاسـتی دەتوانــێ هـەیبێ بـەڵام دیســان بــۆ جیاکردنــەوەی ژن لــەپیاو، بنــەما هــەمان بنەمای فرویدییە واتە ژن پیاو نییە، چونکە ئەنـدامی سێکسـی پیـاوی نییـەو لـەم رووەوە خەسـێنراوە بـەڵام دەبێ ئاگامان لەوەبێ کە بەپێی تێوری لاکـان، پیـاویش

خەسێنراوە، چونکە ئەوەی کە ئەندامە سێکسییەکەی مژدەی پێدابوو، جگە لەخوازەو مەجاز شتێکی دیکە نییە کەواتە بەرلەوەی بڵێین (ئەنجامی زاڵی مرۆڤناسی فرۆیدیی لاکان سیستمێکی باوك سالارانەیە کە بەها بۆ پیاوێتیو لەهەمان رووەوە بۆ زۆربەی پیاوان دادەنێ..و بەپەلە بڵێین ئەو رەسمکردنەی ژن رەسمکردنێکی نێگەتیڤە(رەسمکردنێکە کەلەهەمان رووەوە بەقازانجی پیاوە)، دەبێ بڵێین(پیاو)یش هێندەی زیاتر لەزۆربەی ژنان حەزی بەقبوڵکردنی روخساری ژن نییە وەکو بوونەوەرێکی خەسیو)*جان لچت،١٣٧٨:ص١١٦

لاکان هەرچەندە بەقەد هەوڵی هۆشیارانەی فێمینیستەکان، بۆ رێکخستنی میتۆدی دژی(قسەی میحوەریی anti-logocentric)هەوڵینەدا. کاتێ پرسیارە بێ وەڵامەکەی فرۆید دەهێنێتە مەیدان، واتە(ژن چییدەوێ؟) بەوئەنجامە دەگات کە دەبێ ئەو پرسیارە هەر بێ وەڵام بمێنێتەوە لەوێوە لاکان قسەی ژن بەناجێگیر دەزانێتو باوەڕی وایە کەژن هەرگیز راستو رەوان قسەناکاتو قسەی ژن بەڕاستو رەوانو بە هەڵخەڵەتێنەرانەش دەزانێت. لێرەدا جارێکیتر

دەتــوانرێ هەســت بەمەترسـییەك بكـرێ مەترســی نادیــاری خــزان بــۆ سیســتمێكی نێرانــه كــه ژنــان بۆئەوئاسـته دەبـات كـه تـەنها رۆڵێكـی پـەراوێزییان هەیـەو بەچـەند بوونــەوەرێكی نـاجێگیرو پێشـبینی نــەكراو حولحــولی میــزاج‌و هــەزارو یــەك رەنگیــان دەزانێـت‌و لـەم رووەوە نـەك ژنـان لەبەرچـاو نـاگرێ بــەڵكو دەیانســرِێتەوەو دەیانخاتــه كــەنارەوە ئــەوەی كـەلێرەدا روودەدات، لەرِاسـتیدا رێگرتنـه لـەهێزێكی تازەو پرِجۆش‌و خرۆش كه بەفراوانی لەقسـەی ژنانـدا سـەبارەت بەسیسـتمی زمـانی پیـاو سـالار بەدیـدەكرێ لایــەنی سێكســی ژن راســتەوخۆ هاوشــانی داهێنــانی شـــاعیرانەو بزوێنـــــەرە دەروون جەســـــتەییەكانه كـەدەتوانێت حـوكمی زۆردارانــەی قسـەی لـۆجیكی‌و نێرانه تێك بشكێنێ تیۆرسینه گەورەكانی ئەم بیرو بۆ چوونه جولیا كریستیڤاو هێلین سی‌سون.

جولیـــــا كریســـــــتیڤا بەبـــــــەكارهێنانی چـەمكی(شـیكردنەوەی مانـا)و تـەرحكردنی سـەبارەت بەسروشــتی ژنێتــی، وێــرای ســەلماندنی خــۆی وەكــو یـەكێك لەتیۆرسـینه گرنگـەكانی زمان‌وئـەدەب، وەكـو تیۆرســینێكی فیمینیســتیش بەناوبانگــە، كریســتیڤا

بـــاوەڕی وایـــە کەپێشـــان تـــەنها پشـــت بەئـــەنجامی پەیوەنـــدیی زمـــان دەبەســـتراو لـــۆجیکی ئـــەنجامی پەیوەنـــدیی زمـــانیش بریتییـــە لـــەمیتۆدە زانســـتیو باوەکان کە بەئاراستەی نەهێشتنی ناکۆکی کار دەکەن لەوێوە کریستیڤا دەرکی بە(زمان دەکرد نەك وەکو ئـامرازێکی وەسـتاو، کەشـیکردنەوەی زۆر لەزمانناسـان بـــەوجۆرە بـــوو، بـــەڵکو بەشـــێوە ئـــەکتیڤو نـــەریت شـکێنیو پراکتیکیـەکانی)*(جـان لچـت،١٣٧٨:ص٢٢١) باوەڕی وابوو کە ئەنجامی پەیوەنـدی زمـانو لۆجیکە تایبەتیەکەی ناتوانێت بۆ نموونە زمانێکی وەکو زمـانی شــــاعیرانە شــــیبکاتەوە، کەواتــــە لــــەم رووەوە، چوارچێوەیەکی نەرم ونیانترو لەهەمان کاتدا ئاڵۆزتر پێویسـت بـوو، کریسـتیڤا ئـەم چوارچـێوە تازەیـەی بەتـەرحکردنی چـەمکی(شـیکردنەوەی مانـا) نیشـاندا کەتیایدا شیکردنەوەی مانا پشت بەمادی بوونی زمـان واتـــە( دەنـــگو کـــێشو شـــێوەی نووســـینی زمـــان) دەبەســـتێ، نـــەك تـــەنها بەئـــەنجامی پەیوەنـــدی زمـان(هـەمان سەرچـاوە) . کریسـتیڤا ئـەو سیسـتمەی کەلەســەر بنــەمای ئەنجامیپەیوەنــدیی زمــان بنیــات نــراوە، بەسیســـتمێکی(عـــەقڵانیو داخـــراو ئاشـــکرا)

دەزانێت، لەکاتێکدا کە ئەوسیستمەی لەسەربنەمای شیکردنەوەی مانا فۆرمەڵە بووە،(ناعەقلانی)و (کراوە)و (نادیار)ە وێڕای ئەمەش، کریستیڤا باوەڕی بەجیاوازییەکی گرنگ هەیە لەنێوان(نیشانەی باوSemiotic)و(مەسەلەی رەمزی symbolic) دا (نیشانە)و (رەمز) هەریەکەیان بەڕیز هاومانای یەکترن بۆ(دەقی شاراوەgenotext)و(دەقی ئاشکرا Phenotext) کریستیڤا دەقی شاراوە بەمەسەلەیەکی زمانی نازانێت، بەڵکوزیاتر بەپرۆسەیەكو لەڕاستیدا بەبەردی بناغەی زمانی دەزانێت، بەپێچەوانەی ئەوە دەقی ئاشکرا کە پەیوەستە بەزمانو ئاستی پشکنینی مانای واژەکانەوە لەکاتی خوێندنەوەدا. لەگەڵ ئەوەشدا، کریستیڤا باوەڕی وایەکە شاراوەو ئاشکرا ناتوانن بەجیا لەیەکتری هەبن کریستیڤا شیعر بە(پێگەی تایبەتی) شیکردنەوە دەزانێت، چونکە شیعر لەنێوان ئەم دوو جۆرە سیستمەدا لەحاڵەتی هەڵسەنگاندندایەو زمانی شاعیرانە کە(بەرجەستە بوونی مادیی زمانە) تێکدەری ماناو ڕێگاخۆشکەرێکی تازەیە بۆ مانای نوێ.

کریستیڤا باوەڕی وایە کەلەئەدەبی ئاڤانگارد(پێشڕەوی)سەدەی نۆزدەدا، شاعیرانی وەکو مالارمێ(Mallarme)،بنەمای نیشانەیی زمانیان بەکارهێناوەو لەم ڕووەوە، مەسەلەی عەقلانی زمانیان داوەتەبەر رمبازیی‌و یەك زاتی(بێژەر-راوی)و خوێنەریان تێکشکاندووە،(بکەر)چیتر بەمانای سەرچاوەی مانانییە، بەلکو وەکو(شوێن-chora) مانایەو لەو رووەوە رەنگە تووشی پەرشوبلاوی بنەڕەتی ببێ لەشوناسی خۆیداو گونجانی لەدەست بدات لەڕاستیدا، ئەم باوەڕە کریستیڤای بەرەو تێوری(بکەری بزێو) راکێشا کەتیایدا دەڵێت:(بکەر تەنها بکەری وەستاو وورد بینی کراوی هۆشیاری نییە، بەتەنها دیاردەیەکی وەستاو نییە کە بەم یان بەو فۆرمە خەیاڵییە دەرك دەکرێت-فۆرمێك کەبتوانرێت بگوێزرێتەوە بۆ کەسانی دی- بەڵکو فۆرمێکە ناو وبنەما قبوڵناکاتو سەرکوت کراوە کە تەنها لەرێگەی کاریگەرییەکانیەوە دەناسرێت)* (جان لچت:ص٢٢١-٢٢٢)

بەم پێیە، ئێستا ئیتر بکەر وەکو(شوێن) مانایەو هەروەکو دەبینین، شوێنیش دەگۆڕێ بۆ مەسەلەیەکی

ژنانه کریستیڤا بەبەکارهێنانی دابەشکردنی ئـەفلاتون کـەوجود بـۆ سـێ جـۆر دابەشـدەکات: (هـەبوون)،( بـوون)،(شـوێن)، دەگاتـە ئـەنجامێکی وا بـەپێی بـاوەڕی ئـەفلاتون( هـەبوون) ئـەو ئایـدیا یـان نموونەیەیـە کـە ئەفلاتون بە(باوك) ناوی دەبات،(بـوون) دنیـای هەسـت پێکـراوو ڕەمزەکانــە، دنیــای جوڵــەو بــەردەوامی کــە وێنەیەکـــە لەئایـــدیاو ئـــەفلاتون نـــاوی دەنێـــت (منداڵ)و(شوێن) مادەیەکە کە ئەو بەردەوامیو بوونەی تێـدا ئـەنجام دەدرێ کـە ئـەفلاتوون بـە(دایـك) نـاوی دەبـات کریسـتیڤاش نیشـانە بەرامبـەر بەشـوێنو بـەو پێیــەش بەرامبــەر بەمەســەلەیەکی ژنانــە دادەنــێ( نیشـانە بەرامبـەر شـوێنی ژنـە، کـە کـەمو زۆر هـەمان پێگــەی دایکــە کــەقابیلی نواندنــەوە نییــە جــۆرە خواستگەیەکە، بەڵام خواستگەیەکی ناو قبوڵکەر نییە، چونکە خواسـتگەیەکی لەوبابەتـە ڕاسـتەوخۆ دەیخاتـە نـاو چوارچـێوەی ڕەمزییـەوەو مامەڵەیـەکی ناڕاسـتمان لەبارەیــەوە دەداتــێ شــوێنیش، وەکــو مەســەلەی ژن بەشــێوەیەکی گشــت، لەرەهەنــد مــادیو شــیعرێتی زماندایـــە*هـــەمان سەرچـــاوە ل٢٢٢ . لـــەم ڕووەوە،

کریســـتیڤا، هونـــەرو بەتایبـــەتی شـــیعر بـــەزادەی بەرامبەری نیشانەو رەمز دەزانێت.

بەباوەڕی کریستیڤا، ئەو بزوێنەرو غەریزانەی کە منداڵ لەقۆناغی پێش گرێی ئۆدیپ دا تاقیاندەکاتـەوە، لـــەزمانێك دەچـــێت کـــە هێشـــتا جـــێگیر نـــەبووەو لەکەســـێکدا فۆرمەڵـــە نـــەبووە بـــۆ ئـــەوەی ئـــەم مادە(نیشـانەییە) بگۆڕێ بـە(رەمـز)، دەبـێ جێگیربـێو ئەمەش پێویستی بەسـەرکوتکردنی غەریزەکانـە، ئـەو غەریزانـــەی کـــە تـــاپێش ئـــەوە دەجـــوڵانو هاوســـەنگ بـوون ئەوقسـەیەی کـەدەبێ لەگـەڵ قسـەی نیشـانەیدا بـەراورد بکـرێ، چـەنەبازیbabblcبەرلـەگرێی ئـۆدیبی منداڵـە ئەگەرچـی زمـان خـۆی هەنـدێ لـەم رەوتـە نیشـانەییانە بەتایبـەتی لەشـیعردا هەڵـدەگرێ،دەرك کردنـــی ئـــەم خاڵـــە بایـــەخی هەیـــە بـــۆ ئـــەوەی کـــە هونەرمەند بەئاشکرا دەریـدەبڕێ، لـەرەوتی فێربـوونی زمانیشـدا لای منـدالّ خـۆی نیشـان دەدا بـەم پێیـە، منـداڵ بـەگریانو ئـاوازو هێمـاو ئاماژەکـانی، بـەریتمو تایبەتمەنـــدیی چـــەنەبازیو گەمـــە زمانییـــەکانی،یان بەپێکەنینـەکانی، بـۆ شـاعیریی پێشـڕەو کەرەسـەیەکی خاو ئامادەدەکات ئەمە رەهەندێکی سـەرو زمانییـە کـە

پەیوەستە بەکارێکی دەلالەت کارەوە، واتە کارێ کە دەتوانێ فۆرمی بەردەستوچەقبەستووی رەمزەکان بهەژێنێ بەڵکو فۆرمێکی نوێی لێ بەرهەم بێ*جان لچــــت، ١٣٧٨:ص ص٢٢٢-٢٢٣، لـــەوێوە کەغـــــەریزەو بزوێنـەرە دەروون جەستەییەکان بەرلـەگرێی ئۆدیـپ هــەنو لەگــەڵ جەســـتەی دایکــدان رەوتــی ئــازادی منـداڵانو ئـارەزوو بزوێنـی سـینەی دایـك، یەکـەمین شــوێنی ئــەزموونی بەرلــەگرێی ئــۆدیپی منداڵــە، لەبەرئــەوە( نیشـانە) بەناچـاریی لەگـەڵ(جەسـتەی دایـك)دایـەو لەکاتێکـدا(رەمـز) هەمیشـە پەیوەنـدیی بە(یاسای باوك)ەوە هەیە کە حەزو ئـارەزوو لەمنداڵدا سـەرکوت دەکـاتو بەوشـێوەیە، دەبێتـە هـۆی ئـەوەی قســە بێتــە ئــاراوە ژن بێدەنگییــەکی(نائاگایانەیــە) کەلــەپێش قســەوەیە، ژن(ئــەوی دیــە) کــە لەپشــت مەســەلەی عــەقڵانی زمانــەوە دەوەســتێو هەڕەشــەی لەبەریــەك هەڵوەشــانی مەســەلەی زمــانی ئاگایانــەو عەقڵانی دەکات (رامن سلدن،١٩٨٩:ص١٥٠).

بـەم شـێوەیە، شـاعیری پێشـڕەو-چ ژن بـێ چ پیـاو- دەچـێتە نـاو جەسـتەو دنیـای جەسـتەیی دایکـەوەو لەبەرامبەر یاسای باوکدا بـەرگریی دەکات بـۆ نموونـە

،مالارمــێ بــەئاوەژوو کردنــەوەی یاســاکانی گرامــەر، یاسـای بـاوکیش ئـاوەژوو دەکاتـەوەو لەرێگـەی ئاشـکرا کردنــی رەوتــی نیشـانەیی(دایکانــە)وە بــەدایك دەسـت نیشـان دەکـرێ کریسـتیڤا ئـەم شۆڕشـە شـاعیرانەیە* وادەبینــێ کـە بەشـێوەیەکی گشـتی پەیوەنـدیی نزیکـی لەگــەڵ شۆڕشــی سیاســیو بەشــێوەیەکی تایبــەتیش پەیوەندیی نزیکی لەگەڵ ئـازادی فێمینیسـتی داهەیـە. بــەباوەڕی کریســتیڤا، جوڵانــەوەی فێمینیســتی دەبــێ شـێوەیەك لەئەنارشـیزم( ئـاژاوە گێڕیـی) دابهێنـێ کـە هاوشـانی(قسـەی پێشـڕەو) یـان ئـەدەبی پێشـڕەو بێـت بــەم پێیــە، ئەنارشــیزم بەشــێوەیەکی ئیجبــاریی پێگەیەکی فەلسەفیو سیاسییە کـە تیایـدا، جوڵانـەوەی فێمینیســتی باڵادەســتیوحوکمڕانی نێــر میحوەرانــە وێران دەکات.

نوســینێکی هــێلین سیســو بــەناوی( خەنــدەی میدوسـا)(١٩٧٦) نموونەیـەکی پەسـەندکراوی نووسـینی

* شـۆڕش لـەزمانی شـاعیرانەدا، نـاوی نامـەی دکتـۆرای کریسـتیڤایە کەتێـدا تیۆرێـك دەربـارەی ئامـاژە فۆرمەڵـە دەکات.

ژنانەیە کە بە ژنان دەڵێت(جەستە)یان بخەنە ناو نووسینەکانیانەوە لەکاتێکدا ڤێرجینیا وۆڵف خۆی لەقسەو باس دەربارەی جەستەی ژن دەدزێتەوە، سیسو-پەیامهێنەری قسەی ژن-بەشێوەیەکی زەق دەربارەی رەوتی نەستی ژن دەنووسێت: ( خۆت بنوسەرەوە دەبێ جەستەی تۆ ببیسترێ تەنها لەدوای ئەوەیە کە زۆر سەرچاوە لەنائاگاییەوە بەرەو پێشەوە دەکشێن)* هێلین سیسو،١٩٧٦ص٨٧٥ بەرای سیسو، ژن نابێ خۆی سانسۆربکات، ژن دەبێت ئەندامی سێکسی خۆیو رووبەری فراوانی جەستەی خۆی کەخراوەتە ژێر کۆنترۆڵەوە، ئاشکرا بکات بەشێوەیەکی گشتی، ناوەرۆکی تێوری سیسو هەموو جۆرە ناکۆکیو دوالیزمێك لەنێوان ژنو پیاودا رەت دەکاتەوەو لەم بارەیەوە پرنسیپی دریدا دەربارەی (جیاوازی) بەکاردەهێنێ سیسو بەسووربوونەوە داوامان لێدەکات کە دەربارەی مەسەلەی جیاوازی سێکسی بەوریاییەوە قسەبکەینو دەڵێت رووبەروو بوونەوەی (پیاو-نێر)و(ژن-مێ) ئەگەر بەکاربهێنرێ بۆ ئەوەی تێبگەین کە پیاوان هەموویان ژنێتی خۆیان سەرکوت ناکەن، لەکاتێکدا هەندێ لەژنان تەنها پیاوێتی خۆیان نیشان

دەدەن‌و بەپێچەوانەشەوە بەم پێیە، جیاوازیی لەسەر بنەمای سێکس کەلەرووی کۆمەڵایەتییەوە دیاری کراوە دابەشناکرێ*کیت انسل-پیرسون،١٣٧٥:ص٣٦٤ سی‌سو لەم بارەیەوە لەزگەی فیمینیست دەربارەی بەرهەمەکانی خۆی قبوڵناکات چونکە باوەڕی وایە کە ئەو لەزگەیە دەربڕینی ئەو جیاوازیەیە کەباس لەپێگەی ژنێتی پیاوێتی دەکات، واتە لەکۆتاییدا جۆرێك لەرووبەروو بوونەوەی دوانەیی قبوڵدەکات، واتە رووبەڕوو بوونەوەی ئەو دوو پێگەیەی کە سی‌سو هەوڵدەدات تێکیان بشکێنێ. (بابك أحمەدی ، ١٣٧٨:ص١٧٦)، لەلایەکی ترەوە سی‌سو نووسینی ژنانە لەگەڵ قۆناغی خەیاڵیی‌و بەرلەگرێی ئۆدیپی منداڵ بەپێی روانگەی لاکان بەگرێدراو دەزانێت کەتیایدا جیاوازی لەقۆناغی بەرلەزماندا وجوودی نییە، واتە هەمان یەکێتی یۆتۆپیایی منداڵ لەگەڵ جەستەی دایکدا، هەمان ئەم روانینە بۆتە سەرچاوەی دیدی شاعیرانەی سی‌سو دەربارەی نووسینی ژنان، رەنگە شێوەیەکی تازە سەبارەت بەسێکس بهێنێتە ئاراوە کە تیایدا نە ئەو شتانەی کە ئێمە ئەمڕۆ وەکو شتی-پیاو-و-ژنان- دەیانناسین چیدی وجودیان دەبێت‌و

نــــەلۆژیکی بـــاوی جیـــاوازی لەســـــنوری رووبـــەروو بوونــــەوەی باڵادەســــتی شـــێوەی نێرانــــەی بەڵگـــە هێنانـــــــەوەو فـــــــۆرمی پیاوانـــــــەی سیاســــــەت دەمێنێتەوە(هەمان سەرچاوە، ل٢٦٥).

لوسی ئیریگـاری‌ش کۆمـەڵێ بـیرو بۆچوونی هەیـە کەلەوەی سی‌سو دەچن ئیریگاری ئەو ستەمەی کە پیـاو سـالاریی لـەژنی دەکـات، لـەتیۆری فرۆیـددا سـەبارەت بەسێکســی ژن دەبینـــێ بـــۆ نموونـــە ئیرەیـــی بـــردن بەئەندامی نێرینـەی پیـاو کـە فرۆیـد تـەرحی دەکـات، ژن وەکو ئەوی دی لەبەرامبەر پیاودا لەبەرچاودەگرێ، چونکە وایدەبینێ کـە ئەنـدامی نێرینـەی پیـاوی نییـە بەڕای ئیریگاری، ژن لەبنەڕەتدا وەکو بوونـەوەرێك کـە شـوناس‌و بـوونێکی سـەربەخۆی هـەبێ، بـەدیناکرێ مەگەر وەکو پێچەوانەی ئـەو وێناکردنـەی کەسـەبارەت بـەپیاو هەیـە لـەم مانایـەو لـەروانینی پڕدیقـەتی پیاوانەوەیـە کـە ژنـان چـەند بوونـەوەرێکی نادیـارو نەبینـراون‌و تەنها دەتوانن بوونێکی خـەیاڵییان هـەبێ، ئەویش لەهیستریایان لەدنیای سۆفیگەریی‌و عیرفاندا.

لــــەم روووەوە ئیریگـــاریی ژنو سێکســـی ژن، بـەبوونێکی نەناسـراو وژێـر زەمینـی دەزانێـت (رامـن سلدن،١٩٨٩:ص١٥٠).

ئیریگاری بەبەکارهێنانی دەروونشیکاریی لاکان کـە ئەوەنیشــان دەدات کــە بکــەری بەرووکــەش بــەتاڵ لەزانسـت یــان بکــەری بــەتاڵ لــەزمان هــەردووکیان سێکسـی پیاوانــەیان هەیــە، رەخنەیــەکی بنچـینەیی لەبنەماکانی دەروونشیکاریو زمانو فەرهەنگ دەگرێ، لەبەرئــەوەی ئەوبنەمایانــەش لەســەرەتاوە لەســەرئەوە دروست دەبن کە ژن بەبـەراورد لەگـەڵ پیـاودا شـتێکی کەمــەو لــەم رووەوە، لــەو لایــەی حسابدایە کــە کــورت دەهێنـــێ بـــەڕای ئیریگـــارییو زۆر لەفەیلەســـوفانی فێمینیســـتی دیکـــە، ژنـــان وەکـــو ژن، لەپـــەیمانی کۆمەڵایــەتی لابــراون، چــونکە ژن تــەنها لەکاتێکــدا دەتوانێت لەپەیمانی کۆمەڵایەتیدا بەشداریی بکـات کـە وەکو پیاوی لێبێتو وەکو پیاو قسە بکـات، لـەوێوە کـە- بەقســە لاکــان-زمــان بەشــێوەیەکی لەکەمبوونـــەوە نەهاتوو لەمیحوەری نێردا دەسوڕێتەوە، کەواتـە تـەنها ڕێگەی قسەکردن یان پەیوەندیی دروست کردنـی ژنـان ئەوەیە کە ببنـەخاوەنی ئەنـدامی نێرینـەی پیـاوان ژن

بیـەوێ یـان نەیـەوێ، دەبـێ ئـەو ئەندامـەی نێرینـەی هەبێ کە نییەتی، دەبێ ئـەو کەمێتیـەی نـەهێڵێ، ژن بۆئــەوەی بــەروونی قســەبکاتو پەیوەنــدیی دروســت بکـاتو پەیوەنـدیی لەگـەڵ کەسـانی دیـدا هـەبێ-واتـە کۆمەڵایـەتی بێـت-دەبێـت وەکـو پیـاو قسـەبکات*(جـان لچـت،١٣٧٨:ص٢٤٤ ) ئیریگـاری بـاوەڕی وایـە ژنــان بــۆ ئــەوەی شوناســی لەدەستچــووی خۆیــان بەدەســت بێننەوە، دەبێ نێر میحوەریی مەسەلەی رەمزیی لـەناو بــەرن چــونکە رەگو ریشــەی ســتەم بــۆ ســەر ژنــان لەمەسـەلەی رەمزیـدا بـووە ئیریگـاری وەزعـی ئێسـتای ژنان بە میراتێ ناو دەبات، ئـەو پێگەیـەی کەتیایـدا ژن بـــەهۆی نامۆییـــەوە لـــەو مەســـەلەیەی کـــەبتوانێ بەهۆیــەوە پەیوەنــدی بــەدنیای دەوروبــەری خۆیــەوە بکـات-واتــە مەســەلەی رەمزیــی-پێــوەی گیرۆدەبــووە لەئەنجامـدا ژنــان نــاتوانن ببنــە شــتێکی بابــەتی-یــان بــەلای کەمــەوە بابــەتیبوون دژوارە بۆیــان لەلایــەکی ترەوە، پیاوان نەك تەنها دەتوانن خۆیان وەکـو شـتێکی بابــەتیی بخەنــە روو، بــەڵکو دەتــوانن بابــەتی بــوون بەژنانیش ببەخشن (هەمان سەرچاوە ل٢٤٥).

ئیریگـاری هـەوڵی هێنانـە ئـارای نووسـینی ژنانـە دەدات، نووسینێك كە بتوانێ سەروەری پیـاو وحـوكمی پیاو سـالارانەی سـەرنگون بكـات لـەم رووەوە ئیریگـاری هەوڵدەدات وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە، كـە ژن وەكـو خۆی لەگەڵ ژنانی دیكەدا یان لەنێو ئەوانـدا قسـەبكات سـەراپای بەرهـەمو نووسینەكانیشـی كێشـەو مەسـەلە زمانییـەكانی ژنـان لـەخۆی دەگـرێ لـەوێوە كـەپیاو هەمیشـــە لەپێگـــەی بكـــەردابوونو پێگـــەی ژنـــان بەشێوەیەكی باو تایبـەت بـووە بـە بابـەتبوون، دژواری قسـەكردن وەكـو ژنێـك، بـەلای ئیریگارییـەوە بریتیـە لەوەڵامدانـــەوەی ئـــەم پرســـیارە: ژن چـــۆن دەتوانـــێ قسەبكات؟ بێئەوەی قسەكەی لەهی پیاو بچێت.

ئـەو میتـۆدەی كـە ئیریگـاری بـەكاری دەهێنـێ، بریتیـە لەرێكخسـتنی گفتوگۆیـەك لەگـەڵ تێكسـتو نووســـینەكانی پیـــاوانی ســـەروەرو ســـالاری وەكـــو ئـــــەفلاتونو نیتشـــــەو فرۆیـــــد لەفەلســـــەفەو دەروونشـیكارییەوەكەوە، كەتیایـدا ئیریگـاری لەلایـەن ژنەوە قسەدەكات، بـەڵام نـەك بەقسـەكردن بـەمیتۆدی پیاوان وەكو ئەوان بەڵكو بەقسەكردن لەگەڵ نووسـینی پیاوانـــدا، بـــۆ نموونـــە لەمەعشـــوقە دەریاییـــەكانی

فرێــدرێك نیتشــەدا، ئیریگــاری بەتــەرخانکردنی پێگەیەك وەکو مەعشوقەی نیتشە بۆ خۆی، پرسیار لــەژن دەخاتــە نــاو نووســینەکانی نیتشــەوە بەتــەرخانکردنی پێگەیــەکی لــەوجۆرە بــۆ خــۆی گریمانــەکردنی پەیوەندیــەکی زۆر نزیــك لەگــەڵ نیتشەدا، ئیریگاریی لەدەرەوەو ناوەوەی قسەکەی ئەودا دەجوڵێ، ئیریگاریی سوود لەوشەکانی خودی نیتشە وەردەگــرێ، بــەڵام بەشــێوەیەکی جیــاوازو لاســایی ئامێزوقۆشمە چیانەوعاشقانە، ئەو گفتوگۆیەی کە ئیریگــاریی لەگــەڵ نووســەرە پیاوەکانــدا دەیکــات، بەئاراستەی وێران کردنی بنەمای قسەی پیاوانە،

راستە ئەم تەگبیرە ستراتیجیەی ئەو هێندەش بێ مەترسی نییە بەڵام ئەگەری پەیوەندییەکی نوێ لەنێو رەگەزەکاندا فەراهەم دەکات، پەیوەندییەك کەتیایــــدا ژن چــــیتر بەوێنــــەی ئاوێنــــەیی‌و دەروشانەوەیەکیتر لەپیاوەوە کەم نابێتەوە، بەڵکو لەو گفتوگۆیەدا کە جیاوازیی ژن لەپیاو دەست نیشان دەکاتو مۆڵەتی لەگەڵ بوونو وەك یەکی لەگەڵ پیاودا دەدات بێئەوەی بەرۆڵی لاوەکی نزمی ژن قایل بێت لەگەڵ پیاودا قسە دەکات.

لـەم نێوانـەدا، ئەوكێشـەیەی كـەئیریگاری دەسـت نیشانی دەكات، ڕەمزیی بوونی پەیوەنـدیی نێـوان كـچ و دایكـە بـەڕای ئـەو هـەموو دەروونشـیكاران لـە كاتێكـدا سەبارەت بەجیابوونەوەی منـداڵ لـەدایك و داخڵبـوونی منـداڵ بەقەڵـەمڕەوی زمـان قسـەدەكەن، مەبەسـتیان لەومنداڵە كوڕە كەواتە ئەوە كـوڕە كـە دەبـێ لەڕێگـەی هاتنە ناوەوەی زمان یان نـاوی باوكـەوە خـۆی لـەدایكی جیابكاتەوە كوڕ نـەك تـەنها باوكـە بـەڵكو بكـەرە واتـە پیاوە بەپێچەوانەوە تەنها كچ دایكە بـەم پێیـە، ژنێتـی كچ دەبێ لەئـەزموونی دایكایەتییـەوە سەرچاوە بگـرێ ٭جـــان لچـــت،١٣٧٨:ص٢٤٥ لـــەم ڕووەوە، ئیریگـــاری هەوڵـــدەدات ژن بهێنێتـــە نـــاو مەیـــدانی سیســـتمی ڕەمزییـەوە، بـەكورتی ئـەم مەیدانـە، مەیدانێكـە كـە بـەپێی هەلومـەرجی خـودی ژنـەو شـێوازیی ئیریگـاری لەئەنجامدانی ئـەم كـارەدا پێویسـتی بـە شـێوازی نـوێی گوتـارو ڕێگـا تازەكـانی قسەكردنە،شـیعرێك كـە وەكـو پێویست تازەگەرانەیەو بەیاد هێنەرەوەی مامەڵەیـەكی نوێیـــە ســـەبارەت بـــەژن و ژنێتـــی ٭ئـــەلیزابت گـروز،١٩٨٩،ص ١٠١ لـەم ڕووەوە، ئیریگـاری بەجـەخت كردنـــەوە لەســـەر پەیوەنـــدی كـــچ و دایـــك هـــەروەكو

گەڕانـــەوەی (پرســێ فونـــە) بـــۆلای دایکـــی ئەگـــەری پەیوەندییەکی نـوێ لەگـەڵ جەسـتەو بـەدەنی دایکیـدا دەهێنێتـــە ئـــاراوە کـــە تیایـــدا چـــیتر هـــیچ سەرکوتکردنێك‌و خەساندنێ نابێت،جەخت کردنەوەی ئیریگـاری لەسـەر گەڕانـەوە بـۆ بـەدەنی دایـك، بـۆ دەسەڵاتی دایك وەکو هێزێکی خوڵقێنەر ئامـاژە دەکات دەسەڵاتێك کە هەمیشە بەئاڕاستەی خزمەت بـەپیاوان بووەو تایبەت بووە بە بەرژەوەندی ئەوان، دەسـەڵاتێك کـە پیـاو بـەهۆی فەرامۆشـکردنەوە یـان بـەهۆی نەفرەت‌و بێزارییەوە لەو بەدەنەی کە ئـەو هێناوەیتـە دنیاوە، دەیشارێتەوە.

## میتۆدۆلۆژی فیمینیستی

ئــەو میتۆدۆلۆژییــەی فێمینیســتەکان بــەکاری دەهێــنن چــەند شــێوەیەکی جیــاواز لــەخۆ دەگــرێ فێمینیســتەکان بــۆ گــۆڕینو بەربــەرەکانێی ئــەو بۆچـوونە رووناکبیریانـەی کەتیایـدا پیـاوان بەبـەرزتر لــەژنان لەقەڵــەم دەدەن، کۆمــەڵێ میتــۆدی جیــاواز بەکاردەهێنن تائێستا هەمیشە ئەوە پیاوان بوون کە بیریــارانی باشــتر واتــە عــەقڵانی تــرو جــدی تــرو کاریگــەرتر دەهاتنــە بەرچــاو، بــەڵام میتــۆدۆ لــۆژی فێمینیستی بەشوێن ئەوەوەیەکە ئەم بیرو بۆ چوونانە ئاوەژوو بکاتەوە.

فێمینیستەکانو لەبنەڕەتـدا خـودی ژنـان باوەڕیـان وایەکە نـاتوانرێ بەئاسـانی وەکـو چـەند بوونـەوەرێکی لەبابـەتی فریشـتە یـان شـەیتان، پاکیزەیـان سـۆزانی، هاوسەرێکی بێمێشك یان کچێکیترشاو لەژن بڕوانـرێو لەیەکێك لەم چینو ریز بەندییەدا دابنرێت، ئەمـەش لەکاتێکدایە کە تەواوی ئـەم کێشـەو قاڵبانـە، کارەکتـەر کارییەکە کـە بەدەسـتی پیـاوان ئـەنجام دراوە. میتـۆدۆ

لـۆژی فێمینیسـتی دەیـەوێت ئـەو مامەڵـە خراپانـەی پیـاوان بەرامبـەر بـەژنان دەیکـەن، ئاشـکرا بکـاتو بیانوەسـتێنێ، بـەم پێیـە بـە میتـۆدی تایبـەتی خـۆی، جـارێکیتر لەتـەواوی ئەوکارانەدەکۆڵێتـەوەو ئـەم شـیکردنەوەیە بـە فراوانکردنـی هۆشـیاریی تایبـەتی ژنـانو لەسـەربنەمای ئـەزموونی تایبـەتی ژنـان ئەنجامدەدات.

میتـۆدۆ لـۆژی فێمینیسـتی چـوار بـوار لـەخۆی دەگـرێ کـە بـریتین لـە(بایۆلۆجیـا، زمانناسـی، سـایکۆلۆجیاو، روونـاکبیریی) لـەمیتۆدی بایۆلۆجیـادا زۆرجـار بەسـوود وەرگـرتن لەخوێندنـەوەی توێکاریناسـی، ئـەوە دەسـت نیشـان دەکـەن کـە چـۆن بەشـە جیاوازەکـانی جەسـتەی ژن، وەکـو منداڵـدانو سینە، دەبێ زیاتر بایەخیان پێبدرێو جـەخت لـەرۆڵی گـرنگو بنـەرەتیان بکرێتـەوە لـەمیتۆدی زمانناسـیدا، بەحسابکردن بـۆ جیـاوازی زمـان لـەنێوان ژنو پیـاودا، جـەخت لەسـەر زمـانو پێکهاتـەی تایبـەتی ژنـان دەکرێتـەوە فێمینیسـتەکان باوەڕیـان وایـە لـەوێوە کـە ئێمە لەناوکۆمەڵی پیاو سالاردا دەژیـن، زۆر سـەیرنییە کەزمانیشمان لەژێر دەسەڵاتی پیاوانـدابێ لـەم رووەوە،

فێمینیستەکان بەسوود وەرگرتن لەزمانناسی، شوێن نموونەی تایبەتی کەوتوون بۆ هێنانە ئارای قسەو نووسینو بە شێوەیەك بۆ هێنانە ئارای شێوازێکی تایبەت بەژنان لەزماندا لەمیتۆدی سایکۆلۆجیاو دەروونشیکارییدا، هەروەکو فرۆیدو لاکان نیشانیان داوە، پەیوەندییەکی بنەڕەتی لەنێوان تاکەکەسو نەستیدا هەیەو ئەم مەسەلەیە بەتایبەتی لەزمانو گوتاردا خۆی نیشاندەدات لەم رووەوە فێمینیستەکانی وەکو کریستیڤاو ئیریگاریی بەبەکارهێنانی دەروونشیکاریی، دژی پێشداوەرییە سێکسیەکان وەستانەوە کە لەزمانو مافو فەلسەفەدا هەبوو ئەم دوانە بەبەکارهێنانی ئەم میتۆدۆ لۆژییە لەپێناوی دروستکردنی زمانو فەلسەفەیەکدا هەنگاویاننا کە پێکهاتەیەکی جیاوازیی هەبێ لەزمانو فەلسەفەی باڵادەستو باوو پیاو سالار چوارەم میتۆد، بریتییە لەمیتۆدی رووناکبیریی، ئاسایی هێزە رووناکبیریەکان لەپێناوی شیکردنەوەو کەمکردنەوەی بایەخو بەهای رۆڵی ژنان لەکۆمەڵدا کاریان کردووە فێمینیستەکان هەوڵدەدەن بەبەکارهێنانی ئەو پەیوەندییەی کە رووناکبیریی کۆمەڵێك بەتێگەیشتنی سەبارەت بەژن

هەیەتی، رەخنـە لەبنـەمای رووناکبیریی‌و ئایـدیۆلۆژی کۆمـــەڵ بگـــرن، بـــەم پێیـــە، پێگـــەو شـــوێنی شـــیاوو راستەقینەی ژن بۆ ژن بگەڕێننەوە.

بــەلای فەیلەســوفە فێمینیســتەکانەوە گــەڕان‌و پشکنین بـەناو ئـەو میراتـەدا گرنگـە کـە نیتشـە بـۆی بەجێهێشـتوون، ئــەو فەیلەسـوفانە لـەنێوان بنــەماو خولیـای فێمینیسـتی خۆیـان‌و زۆر بنـەمای فەلسـەفیی بـیری نیتشـەدا، نزیکییـەکی زۆریـان بـەدیکردووە، بـۆ نموونــــە زۆر لەبنــــەما گرنگــــەکانی رەخنــــە فیمینیستیەکان کە لەمێژووی فەلسەفە گیراون، لەگەڵ رەخنــــەی نیتشــــەدا لەفەلســــەفە یەکســــانن، زۆر لەفەیلەسوفە فێمینیستەکان ئـەوەیان خسـتۆتەڕوو کـە فەلســەفە، بەشــێوەیەکی بــاو، لەلایــەن پیاوانێکــەوە نووسراوە کە بـەهای تایبـەتی‌و باڵایـان بەشـتەکانی تـر داوە، ئــەو پیاوانــە زیهنیــان لەســەروو بــەدەن‌و فەرهـەنگیان لەسـەروو سروشـت‌و عـەقڵیان لەسـەروو ناعەقڵانییــەت‌و حەقیقــەتیان لەســەروو خــەیاڵ‌و خێریـان لەسـەروو شـەڕەوە دانـاوەو لـەوێوە کـە ژنـان‌و سـیفەتی ژنانــەو دایکانــەی ژنــان هاوشــانی بــەدەن‌و سروشت‌و ناعەقڵانییەت‌و خـەیاڵ‌و شـەڕە، بۆیـە رێگـە لــەژنان گــیراوە بــۆ چــوونە نــاو مێــژووی فیکــرو فەلسـەفەو بەمپێیـە، لـەتێڕوانینی جـدیی‌و عـەقڵانی

فەیلەسـوفەکاندا- کـە دەتـوانین بڵـێین تەقریبـەن هەموویان پیاون- نادیدە گیراون، بەدەربڕینێکی دیکە، ئـەوەی فەیلەسـوفەکان وەکـو ئـەزموونی مرۆڤایـەتیی، خستوویانەتەڕوو، لەڕاستیدا تەنها ئـەزموونی پیـاوان‌و هەڵبەتـە هـی ژمارەیـەکی تایبـەت لـەپیاوان بـووە، لـەم ڕووەووە بـەباوەڕی فێمینیسـتەکان، دەبـێ ئـەوەی ئـەو فەیلەسوفانە دەریانبڕیووە، جارێکی تر لێیبکۆڵرێتـەوە. لەبەرئەوەی تـەنها بەڕووکـەش بابـەتییبوون دەنـوێنن: لەکاتێکـدا کـە تـەنها فەلسـەفەو ئـەزموون‌و مێـژووی مرۆڤ، هەموو کەسە جیاوازەکان لەخۆ بگرێ، دەتـوانین ئومێـدەواربین کـە ئـەو نموونـەو ئەزموونانـە بـۆ سەراپای مرۆڤایەتین.

هەندێکی تـر لەفێمینیسـتەکان ئاماژەیـان بـۆ ئـەوە کـردووە کـە بابـەتییبوون یـان راسـتیی، لەچـەند گۆشـەنیگایەکی تایبەتـەوە بەدەسـت دێـن‌و بـاس لەبارەیانـەوە بـەجیا لـەو کەش‌وهەوایـەی بەسـەریاندا زاڵـە گومڕاکـەرە، نیتشـەش لەنووسـینەکانیدا هـەمان ڕەخنـەی لەبابـەتییبوون‌و راسـتیی هەیـە، نیتشـە وا قسـەدەکات کـە هـەر راسـتییەك لەگۆشـەنیگایەکی تایبەتییـەوە بەرهەمـدێت‌و بـەبێ بـوونی گۆشـەنیگا،

تێگەیشتن لەهیچ راستییەك كاریكردە نییـە، هـەروەكو دەبیـنین، ئـەم گۆشـەنیگاكارییەی نیتشـەش دەتوانـێ بەئاراسـتەی پشـتیوانیی لەبـەهاكانی ژنـانو سـیفەتە ژنانیەكان بەرەوپێش دەچێت.

وێـڕای ئەمـەش، نیتشـە بـاس لەچـەند میتۆدێـك دەكـات كـە بـەهۆی بەكەڵكییانـەوە چـەندین راسـتییو بـــەهاو پێگـــەی تایبـــەتییان بـــۆ كۆمـــەڵێ كـــەس فراوانكردووەو خۆیـان وەكـو بـەهای بـاڵاتر نیشانداوە، بـۆ نموونــە لـەكتێبی (ئاركیۆلۆژیـای ئاكـاردا) نیتشـە كۆمەڵێ بەهای وەكو ئەو بەهایانەی كە زیهـن لەبـەدەن بەباڵاتر دەزانن، دەخاتە ژێـر پرسـیارەوە، لەبەرئـەوەی بەباوەڕی نیتشە، ئەو بەهایانە دەبنەهۆی ئەوەی ئێمـە دوچـاری بێتوانـاییو لەئەنجامـدا دوچـاری گونـاهبین، نیتشە لەم بەرهەمەیداو لەتـەواوی بەرهەمەكانیشـیدا، رەخنــە لــەو مــافی پێشخســتنو باڵاییــە دەگــرێ كــە بەزیهن نەدراوەو بەبەدەن دراوەو لـەوێوە كـە ژنـان بـە بــەدەنیان جیادەكرێنــەوە، تەئكیدكردنــەوەی نیتشــە لـەگرنگی بـەدەن، بـۆ فەلسـەفەی فێمینیسـتی مایـەی ئومێدەوارییـە، وەكـو لەڕەخنـەی نیتشـەدا لەخواسـتی حەقیقەت یان ئارمانی دوورەپـەرێزیی هەنـدێ مـەیلی

فێمینیستی هەیە کە تەئکید لەبەدەنو سەماو چالاکییو پێکەنین دەکاتەوە، هەروەها ئەو میتۆدانەی کە ئەو بەکاریاندەهێنێ بۆ ئەوەی بەهۆیانەوە ئەوە نیشان بدات کە بۆچی بەها بەهەندێ شتی دیکە زیاتر دەدرێ، دەتوانێ بۆ هەوڵی فیمینستەکانو فەیلەسوفاتی فیمینیست لەلێکۆڵینەوەی ئەو مەسەلەیەدا بەکەڵك بێ کە بۆچی ژنانو تایبەتمەندیی ژنانەو دایکانەی ژنان لەلایەن فەلسەفەی کۆنەوە بێبەها کراوەو ڕێگە لەچوونە ناوەوەی ژنان بۆ ناو مێژووی بیر گیراوە، بەم پێیە، نیتشە بەهێنانە ژێر پرسیاری عەقڵو ڕۆشنبیریيو ڕاستییو خێر کۆمەڵێ شتی دیکە دەخاتە ژێر پرسیارەوە کە بۆ بێتوانا لەقەڵەمدانی ژنانو ڕێگرتن لێیان بۆ هاتنە ناو فەلسەفەوە بەکارهێنراون، بۆ نموونە نیتشە ئەو شتانەی کە عەقڵ لەناعەقڵانییەت بەباڵاتر دەزانن لەڕێگەی ئەو ئیدعایەوە دەخاتە ژێر پرسیارەوە کە ئەو باڵاییو بەهایەی کە ئێمە بۆ عەقڵمان داناوە، بەرهەمی لۆجیكو عیللەتو مەعلومە کە خودی ئەم مەسەلەیەش بەرهەمی ڕێزمانە، نیتشە باوەڕی وایە کە زمانو وشەکان، واتە

ئەو ئامرازانەی کـە ئێمـە بەهۆیانـەوە لـەبارەی دنیـاوە قسـەدەکەین، ڕێـك ڕەنگدانـەوەی جیهـانو شـتەکانی نـاوی نـین، بـەڵکو بەڕاسـتی مانایـەك دەخـوڵقێنن کـە ئێمـە بـەهۆی زمـانو وشـەکانەوە دەیـدەین بـەجیهان، هەمان ئەو بیرەی کە زمان دەتوانێت لـەجیاتی ئـەوەی ڕێـك واقیـع نیشـانبدات، مانـا بخوڵقێنـێ، هـەروەکو دەبیـنین دەتوانێـت بـۆ فەلسـەفەی فێمینیسـتی بەسوودبێ.

وێـڕای ڕەخنـەی نیتشـە لەعـەقڵ، ڕەگـەزەکانی ناعەقڵانییـەت دەگەڕێنێتـەوە بـۆ فەلسـەفە، نیتشـە لەپەسـەندکردنی دیۆنیـزۆسو هەوڵەکانیـدا بـۆ بەرجەسـتەکردنی فەلسـەفەی دیۆنیزۆسیـی زۆر بەناوبانگـە، دیۆنیـزۆس خـودای بـەرداریو جۆشوخرۆشـەو لـەوێوە کـە بـەدەن، جۆشوخرۆشـی ناعـەقڵانیی تایبـەتی ژنانـە، دیسـان بـەهادانان بـۆ جۆشوخرۆشـی بـەدەن، لەلایـەن نیتشـەوە، دەتوانـێ ببێتەهۆی بەهادانان بۆ ژنان.

ڕەخنـەی نیتشـە لـەدوالیزمی فەلسـەفی یـان میتـافیزیکی- بەشـێوەیەکی گشـتی- دوا لیزمـی جنسـی- بەشـێوەیەکی تایبـەتی- لەڕوانگـەی هەنـدێ

لەفێمينيستەكانەوە دەتوانێت بۆ فەلسەفەى فێمينيستى سوودمەندبێ، هەرچەندە ژمارەيەك لەفێمينيستەكان باوەڕيان بەدواليزمى جنسى هەيە، كە نيتشە بەتايبەتى سەبارەت بەئەخلاقى خاوەن كۆيلەو كۆيلەكان تەرحى دەكات، لەم رووەوە دواليزمى جنسى نيتشە لەگەڵ پرانسيپە فيمينيستيەكاندا بەناكۆك دەبينن.

## رەتكردنەوەى دواليزمى سێكسى

نيتشە بەرەتكردنەوەى دواليزمى كۆسمۆلوجياو دواليزمى فەلسەفەى كۆن، لەڕاستيدا دواليزمى سێكسيش رەتدەكاتەوە، هێرشى نيتشە بۆ سەر دواليزم، بەتايبەتى لەكتێبى (ئەو ديوى خێرو شەڕ)دا بەديدەكرێ، هەرچەندە لەيەكەم بەرهەمى فەلسەفيدا واتە (لەدايكبوونى تراژيديى لەرۆحى موزيكا) وە دواليزمێكى سەرەتايى بەديدەكرێ، واتە نيتشە لەوێدا بەجياوازيى لەنێوان ڕواڵەتو واقيع قايل دەبێو ڕواڵەت وەكو ڕووبەڕووبوونەوەى (ئەپۆلۆن- خوداى خۆر) لەگەڵ ديڤينزۆس، دەبينێ لەڕووبەڕووبوونەوە

لەگـەڵ واقیعـدا، بـۆ نموونـە شـادومانی یۆنانیـەکان کاردانەوەیەك بوو لەبەرامبەر ئـەو ترسـەدا کـە ئـەوان لەبەرئـەوەی تێگەیشـتنێکی قووڵیـان هـەبوو سـەبارەت بـە (نـاکۆکیو یەکـەم ئـازار لـەدڵی یەکـەم (یـەکتایی-وحدانیـە)دا (زایـش تـراژدی، ص ٦) هـەیانبوو، یـان عەقڵانیـەتی نائاسـایی ئـەوان، کاردانەوەیـەك بـوو لەبەرامبەر سروشتی نائاسایی ناعەقڵانیاندا.

لـەوێوە کـە نیتشـە، بـاوەڕی وایـە سـەردەمی بیرکردنـەوەی دۆگمـایی بەسەرچـووە، ڕووبـەڕووی دیدگای بیرکردنەوەی دۆگمایانـەی فەیلەسـوفانی پـێش خـۆی دەبێتـەوەو ڕەخنـە لەپێشـداوەریی ئـەو فەیلەسـوفانە دەگـرێ، یـەکێك لـەو پێشـداوەریانە، باوەڕکردنـە بـەناکۆکی بـەهاکان: (بنچـینەی ئـەم پێشـداوەرییە، باوەڕێکـە کـە دەڵێـت هـەر شـتێك کـە (خێـر)ێکـی بـێ مەرجـە، دەبـێ هـاودژێکی هـەبێ کـە ئـەویش (شـەڕ)ێکـی بـێ مەرجـە، ئـەم بـاوەڕە ئـەو ئەنجامـە ناوەکیـەی لەگـەڵ خۆیـدا هـەڵگرتووە کـە بێغەلوغـەش بـوونی (خێـر) یـەعنی ئاوێتـەبوونی لەگەڵ (شەڕ)دا، خێر نابوتو ئـالوودە دەکات، (استنلی مـك دانیـل، ١٣٧٩، ص ١٣٣) ئـەم دژایەتیـە فەلسـەفیانە

بـریتین لەدژایـەتی نێـوان خێـر/ شـەڕ، زیهـن/ بـەدەن، حەقیقـــەت/ خـــەیاڵ، بیرکردنـــەوەی بـــەئاگا/ بیرکردنەوەی بێئاگاو دواجـار پیـاو/ ژن، بـەڵام نیتشـە دەربـارەی جۆراوجـۆریی دوالیـزم دووجـۆر گومـانی هەیـە: (چـونکە یەکـەم دەتـوانرێ سـەبارەت بـەم مەسـەلەیە گومـان بکـرێ کـە ئایـا قـەت دژایەتیـەك هـەبووە، و دووەم ئەوەیـە کـە زیـاتر ئـەم بەهادانانـە ڕەشـۆکیانەو دژایـەتی بـەهاکان، کـە ئەوانـەی باوەڕیـان بـەمیتافیزیك هەیـە لەزگـەی خۆیـان لێـداوە، جگەلـە بـــەهادانانی ڕواڵـــەتی مەســـەلەکانو گۆشـــەنیگایەکی سـەرپێیی شـتێکی دیکـە نـەبن (فراسـوی خـیرو شـر، ص٢). نیتشـە لەسـەرەتادا گومـان دەکـات کـە ڕەنگـە دژایـەتی لـەمجۆرە هـەرگیز وجودیـان نـەبێو پاشـان گومـان دەکـات کـە ئەگـەر دژایـەتی لـەمجۆرە هەشـبن، ڕەنگـە تـەنها بـەهۆی گۆشـەنیگایەکی تایبەتییـەوە بایـەخیان هـەبێو ئەوانـەی پێیـان دەوتـرێ (دژەکـان) لەبنچـینەدا یـەك بـنو پێکـەوە پەیوەسـتبن: (زیـاتر ئـەوەی مایـەی بـەهاداریی مەسـەلەیەکی وا پەسـەند کـراوە، بریتیـە لـەو پەیوەندییـە بەئەدەبانەیـە کـە لەگـەڵ مەسـەلە خراپەکانـدا هەیـە کـە بەڕواڵـەت دژ

بەخۆیانــەو بەیەکــەوە پەیوەســتن‌و بەیەکداچــوون، زیاتر لەیەك جەوهەرن، زیاتر! (هەمان سەرچاوە).

رەخنــەی نیتشــە لەبیروبۆچــوونی فەیلەســوفە کۆنەکان لەبارەی بیری هەست‌و نەستەوە کە یەکێکە لــەو دوانــە دژ بەیەکانــە کــە تائێســتا هــەموو فەیلەسـوفەکان پشـتیان پێبەسـتووە، بـەو بانگەشـەیە دەســت پێــدەکات کــە دەڵێــت: (گــەورەترین بەشــی ئەندێشـەی بـەئاگا لـەوانیش ئەندێشـەی فەیلەسـوفانە دەبێ وەکو کرداری غـەریزی لەقەڵـەم بـدرێ).( هـەمان سەرچـاوە، ل٣) نیتشـە لەدرێـژەی قسـەکانیدا دەڵێـت (وردە وردە ئــەوە بــۆ مــن ڕوونبۆتــەوە کــە هــەر فەلسـەفەیەکی گـەورە تـا ئێسـتا جگەلـە دان پێـدانانی تایبـەتی نووسـەرەکەی‌و جـۆرێ لەیاداشـت نووسـینی نەویسـتراوو نـەزانراو شـتێکی دیکـە نـەبووە) .(هـەمان سەرچاوە ل٦) نیتشە باوەڕی وایە ئەو سیستمانەی کە فەیلەسـوفەکان دایـدەنین، دەربـڕی سروشـت‌و خـوی ئەوانـە. نیتشـە، سیسـتمی فەیلەسـوفە بەناوبانگـەکان لەچوارچـێوەی هەڵسـەنگاندنی بـەهای ئەخلاقیانــدا شیدەکاتەوەو دەڵێت (فەیلەسوفی ڕاستەقینە، هەمیشە قــوڵترین (پاڵنــەرەکانی) خــۆی لەئەندێشــەکانیدا

پێچەوانە دەکاتەوە) چونکە (زانا سەروەری خوازەو لەو لایەنەوە هەوڵ بۆ فەلسەفە لێدان دەدات). (هەمان سەرچاوە). هەڵبەتە ئەمە بەو مانایە نییە کە هەموو ئەندێشەیەکی بەئاگا دەتوانێ لەسنووری غەریزەدابێ، چونکە بۆچونێکی لەوجۆرە، نیتشە تا ئاستی ماتریالیزم دادەبەزێنێو ئەمەش لەکاتێکدایە کە ئەو هەوڵدەدات لەوە ڕادیکالانەتر مامەڵە بکات، جگەلەمەش لەوێوە کە نیتشە باوەڕی بە (پرانسیپی پەیوەستیی) هەیە، واتە باوەڕی بەوە هەیە کە بەرزترین کاری فیکریی، بەشێوەیەکی تەواو بەنزمترین ڕەفتاری ژیانیەوە پەیوەستە، هەروەها باوەڕی بەوەش هەیە کە هەموو شتێ لەدژەکەی خۆی دروست بێو دژی ئەو پێشداوەرییەیە کە هیچ شتێ ناتوانێ لەدژەکەی خۆی دروست بێ، نیتشە، لەبواری پەیوەندییە مرۆییەکانیشدا بەبیرێکی لەوجۆرە قایلە، بۆ نموونە (تەئکید لەوە دەکاتەوە کە دۆستایەتیی‌و دوژمنایەتیی پەیوەندیی زۆر نزیکیان هەیەو دادپەروەریی‌و تاوانکاریی دوو ڕووی یەك دراون، وەهەتا ڕەنگە بەرزترین بەها مەعنەویەکانیش

لەقوڵترین بزوانـدنی سێکسـیدا ڕەگو ریشـەیان هـەبێ) (استنلی مك دانیل، ۱۳۷۹، ص ۱۳)

ئەندێشەی بێئاگا یـان غـەریزی، بەشـێوەیەکی بـاو، هەمیشە لەگەڵ بەدەندا بووە، لەکاتێکدا کە ئەندێشەی بەئاگا هەمیشە لەگەڵ ڕۆحدایـە بـەڵام نیتشـەش وەکو دیکارت باوەڕی وایە کە نـەفس، ڕۆح یـان زیهـن لەگـەڵ بەدەندا یەك گەوهـەریان هەیـە، نیتشـە پێکـەوەبوونی نائاگـا لەگـەڵ بـەدەنو بـەئاگا لەگـەڵ ڕۆحـدا ڕەتدەکاتـەوە، چـونکە هـەردووکیان وا دەبینـێ کـە پەیوەسـتن بەیەکـەوە. نیتشـە لـەم بارەیـەوە دەڵـێ: (هۆشیاری، دوا قۆناغی کامڵبوونی سیستمی بوونـەوەرە زیندووەکانو دواجار ناچزترینو لاوازترین بەشی ئـەو سیسـتمەو سەرچـاوەی کۆمـەڵێ هەڵـەی بێشـومارە کـە دەبنەهۆی ئەوەی هەموو بوونەوەرێکی زیندوو هـەموو ئینسانێ زوتر لەوکاتەی کە بڕیارەو هـۆمێرۆس وتـەنی (وێـرای چـارەنووس) لـەناو بچـێت، ئەگـەر شـوێنگەی غـەریزەکان، کـە پـارێزەرو پاسـەوانە تـا ئـەو رادەیـە لەهۆشـیاری بـەهێزتر نەبوایـەو بەگشـتی ڕۆڵـی ڕێکخەری نەگێڕایە، بێگومـان مرۆڤایـەتی لـەژێر بـاری بڕیاری ناعەقڵانیو قسەی بێ مانـاو هـیچو پووچـیو

ســاویلکەییدا دەینالآنــدو بــەکورتی هۆشــیاری خــۆی لەپێدەخســت، بــەدەربڕینێکی دیکــە، بــەبێ ئــەم غەریزانــە دەمێـك بـوو لەناوچـوو بـوو!) (دانـش شـاد ص١١)

نیتشــە، وەکــو بونــەوەرێکی زینــدوو لەهۆشــیاری دەڕوانــێ کـە لەگەشـەکردنو پێگەیشـتنو جووڵەدایـە: (بەباوەڕی من ئـەوە ویـژدانی ئاگـاو نـاوەڕۆكو چـەقی قورسایی بوونی ئینسانیی هـەر کەسێکە کـە فاکتـەری بـەردەوامو هەمیشـەییو بـالآترو بنچـینەیی ئەوکەسـە پێکـدەهێنێ: ئێمـە وەکـو شـتێکی جـێگیر لەهۆشـیاری دەڕوانـــین! گەشـــەکردنو هەســـتانو نیشـــتنەوەی ڕەتدەکەینــەوەو وەکــو (یــەك بوونــەوەری زینــدوو) لەبەرچاوی دەگرین! مرۆڤ بەزەحمەت لـەوەحاڵی بـووە کە دەبـێ بـوونی خـۆی لەگـەڵ داناییـدا ئاوێتـە بکاتو دانایی لەخۆیـدا بکـات بەغـەریزە) (هـەمان سەرچـاوە) لــەم ڕووەوە، ئەندێشــەی خودئاگــا، هێشــتا چــاوەڕێی یەکبوونە لەگەڵ غەریزەدا.

نیتشە، نەك تەنیا بوونی دوو گەوهـەری دوانـە بـۆ ئاشـــکراکردنی دوالیزمـــی بـــیری بـــەئاگاو بێئاگـــا بەپێویسـت نازانــێ، بــەڵکو ئــەو بەهایانــەش ئــاوەژوو

